كزافيه دى مونتابين



# ژنه نانفرۆشه‌كه



## ڕۆمان بۆ مێردمندالان




وه‌رگێڕانی :

ئیدریس عه‌بدوڵلا

كزافيه دى مونتابين

# ژنە نانـــفرۆشەکە

## ڕۆمانی مێردمنداڵان

و: ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا

بسم الله الرحمن الرحيم

- ناوی كتێب: ژنه نانفرۆشەكە

- جۆری كتێب: رۆمانی مێردمنداڵان

- نووسەر: كزافیە دی مونتابین

- وەرگێڕ لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی:  رەمزی بەعلەبەگی

- وەرگێڕ لە عەرەبیەوە بۆ كوردی: ئیدریس عەبدوڵڵا

- چاپ: یەكەم

- چاپخانە: شڤان

- شوێن: سلێمانی

- تیراژ: ٥٠٠ دانە

- مێژوو: ئایاری ٢٠٠٤

- بڵاوكەرەوە: كۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی كوردستان

١ـ (حەننە) و (جاك):

لە سێی ئەیلولی ١٨٦١، خاتوو (حەننە فۆرتیە) لە فۆرتفیل بەرەو دوكان دەچوو، بە دەستە ڕاستی گالۆنێكی هەلگرتبوو، بە دەستە چەپیشی (جۆرج)ی كوڕی گرتبوو، كە (جۆرج) بەردەوام چاوی لەسەر ئەو ئەسپە دارینەیەی بوو، كە بەدوای خۆیەوەی ڕادەكێشا.

كاتێك گەیشتنە جێ، (حەننە) بە ژنە دوكاندارەكەی گوت:

ـ (بە یارمەتی خۆت، ئەم گالۆنەم بۆ پڕ بكە لە نەوت)!

ژنە دوكاندارەكە بە سەرسوڕمانەوە پێی گوت:

ـ (بەڵام من دوێنیش ئەم گالۆنەم بۆ پڕ لە نەوت كردی)!

ـ (ڕاست دەكەیت.. بەڵام كوڕەكەم چووبوو دۆزیبوویەوە، كە من لە كوێم شاردۆتەوەو، هەمووی ڕشتبووە سەر زەوی).

ـ (جا دەبێ زیاتر ئاگاداربیت، چونكە نەوت ترسناكە، بۆیە دەبێت گالۆنی نەوتەكە لە شوێنێكی وا هەڵبگریت، دەستی كوڕەكەتی پێ نەگات، ئەگینا دەبییە هۆی ئەوەی كارگەكە بسووتێت).

ئینجا پاش وەستەیەكی كورت، ژنە دوكاندارەكە لێی پرسی:

ـ (ئایا بەو كارەی كارگەت ئاسوودەیت؟ یان حەزدەكەیت كارێكی تر بكەیت)؟

(حەننە) وەڵامی دایەوە:

ـ (ناچارم خاتوونەكەم.. خاوەن كارگە چاكەی لەگەڵ كردم، كە وەكو پاسەوان لای خۆی دایمەزراندم.. بەڵام ئەم كارە بۆ ژن زۆر گونجاو نییە، هەروەها كاركردنم لێرە، هەمیشە مێردەكەم

بیردێنێتەوە، کە لە ناو ئەو کارگەیەدا کوژرا، جگە لەوەش کچە بچکۆلانەکەم تا ئێستاش لە لای دایەنەکەیتی لە گوندی جوانی، ئەمەش لە هەر مانگێکدا سی فرەنکم لەسەر دەوەستێنێ، کە ئەوەش پارەیەکی زۆرم لەسەر دەوەستێنێت و، پەیداکردنی بەم کارەی ئێرەم ئاسان نییە).

ـ (نیگەران مەبە، بێگومان دەبێ ڕۆژێك بێت، پیاوێك بتخوازێت و، لەو خەرجییە زۆرانەت دەربازت بکات).

ـ (ئەوە چ دەڵێی تۆ؟! پەنا بە خوا من ناپاکی لە مێردەکەم بکەم.. دواتر من تەنها دوو هەزار فرەنکم پێویستە، ئەوەندەیە جارێ ئەو پارەیە لە خەویشدا نابینم).

ئینجا (حەننە) خواحافیزی لە ژنە دوکاندارەکە کرد و، لە دوکانەکەیدا هاتەدەر.. بەڵام ژنە دوکاندارەکە لە بیری ئەو بێوەژنەدا مایەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی:

ـ (حەننە ژنێکی جوانەو، تازە تەمەنی بیست و پێنج ساڵە.. ئەدی چی وای لێدەکات، لە دوای مردنی مێردە میکانیکیەکەی، کە ناوی (بوترس فۆرتییە)بوو و، لە کارگەکەی (جیل لابرۆ) کاری دەکرد، شوو نەکاتەوە؟! ئەدی پێویستی چیی بە دوو هەزار فرەنك هەیە؟!)

ژنە دوکاندارەکە وەڵامی ئەوپرسیارانەی بۆ نەدرایەوە، بۆیە وای گومان برد، کە (حەننە) ژنێکی بە تەماعە.

بەڵام (حەننە) وەها نەبوو، بەڵکو هەموو مەبەستی ئەوەبوو، ژیانی دوو منداڵەکانی مسۆگەر بکات، بۆیە دەیەویست کارگەیەکی

دروومـــان دامەزرێنێــت و، خــۆی سەرپەرشــتیی بکــات، تــاوەکو بــۆ بەخێوکردنی ئەو منداڵانەی پێویستی بە مێردکردنەوە نەبێت.

کاتێك (حەنـنە) بـەرەو کارگـە دەگەڕایـەوە، پیاوێك بە ناوی (جاك جیرۆد) بانگی کرد و، پێی گوت:

ـ (حەنـنە تـۆ لـە مـن ڕادەکەیت.. هەرچـەندە دەزانـی مـن زۆرم تۆ خۆشدەوێت)!

(حەننە) قسەکەی پێ بڕی و، پێی گوت:

ـ (مـن زیاتـر لە جارێکم پێ گووتووی، کە ئەو خۆشەویستییەی تۆ بـۆ مـن لـەجێ نیـیە، چـونکە مـن دوای کوژرانـی مـێردەکەم شـوو ناکەمـەوە، لـە پاشانیش ئەوە لەبیر مەکە، کە تا ئێستاکە، بە هەمووی پێـنج مـانگ بەسـەر کوژرانی بوترسی مێردمدا تێپەڕیوە، کە هاوڕێی تۆش بووە).

ـ (جـا تـۆ لـەو بـاوەڕەدای، گـەر لـە پـاش نـەمانی ئـەو مـن تـۆم خۆشـبووێت، ئـەوە ناپـاکی بێـت لـە دەرهەق ئەو؟! نەخێر مەسەلەکە تـەواو پێچـەوانەی ئەوەیـە، چـونکە مـن مەبەسـتمە بـە هێـنانی تـۆ، ژیـانی تـۆو، دوو منداڵەکانیشت ئاسـوودە بکـەم.. ئـەو مووچـەیەی تۆ وەریدەگـری زۆر کەمـە، بـەڵام مووچـەی مـن، لـە هـەر ڕۆژێکدا پانزە فـرەنکە، دیـارە ئـەو پارەیـەش بۆ ئێمەش و بۆ منداڵەکانیشت، مایەی ئاسوودەیی و دابینکردنی ئایندەیەکی گەشە).

ـ (دەزانم تۆ نییەتت پاکە، بەڵام من بڕیارم داوە شوو نەکەمەوە).

- (پەلە مەکە.. ئەوەش بزانە، کە ڕۆژێك دادێ، من دەبمە خاوەنی پارەو سامانێکی زۆر، دواتر من بەر لە کوژرانی مێردەکەشت تۆم خۆشدەویست، بەڵام ئەو خۆشەویستییەم لە دڵی خۆمدا شاردبووەوە، ئەوەش لەبەر بوترسی مێردت، کە ڕێزی ئەوم دەگرت).

(حەننە) دوای ئەوە درێژەی بە ڕۆشتنەوەکەی خۆیدا، (جاك جیرۆد)یش دوای کەوت، هەوڵی دا گالۆنە پڕ لە نەوتەکەی بۆ هەڵبگرێت، بەڵام (حەننە) ڕازی نەبوو، پێی گوت:

- (نا قەیناکات، قورس نییە، بە هەمووی چوار لیتری تیایە).

(جاك جیرۆد) کە زانی (حەننە) ڕووی پێنادات، لەمەدا لێی توند کردو، پێی گوت:

- (کچێ ئاگادار بە، ئەم نەوتە ترسناکە، چونکە خێرا ئاگری لێدەکەوێتەوە، دواتر (جیل لابرۆ)ی خاوەن کارگەش یاساغی کردووە، نەوت ببرێتە نێو کارگە)!

(حەننە) گوتی:

- (من ئەوەم نەزانیوە، لە بەیانیەوەش لەم بارەیەوە وەك تۆ دەڵێی وادەکەم).

کاتێکیش گەیشتنە ژوورەکەی (حەننە)، (جاك جیرۆد) وازی لێ نەهێناو، گوتی: من ئێرە جێناهێڵم، تا وادەی ئەوەم نەدەیتێ، کە بیر لەو مەسەلەی شووپێکردنەم دەکەیتەوە)!

بۆیە (حەننە) بە ناچاری وادەی ئەوەی پێدا.

٢. (جیل لابرۆ):

(جاك جیرۆد) جێگری سەرۆکی کارگە بوو، تەمەنی لە سی ساڵ تێپەڕی نەدەکرد، خاوەنی کارگە شارەزای ببوو، کە زۆر زیرەك و چالاکە، بۆیە لە خۆی نزیك کردبۆوەو، کردبوویە جێگری خۆی، ئەوکاتەش (جاك جیرۆد) بە (حەننە)ی گوت: (خۆشتم دەوێت).. لەوەدا درۆی نەدەکرد، بەڵام لەوانە بوو، کە هەر جارەی بە شتێکی دەگرن و، دواتریش ئەگەر شتەکەیان بۆ نەبوو، زۆریان بەلاوە گرنگ نییە، بە ئاسانی لەبیریان دەچێتەوە، واتە کەسێکی دامەزراو نەبوو، هەروەها زۆری حەز لە دەوڵەمەندبوون بوو، بۆ ئەو مەبەستە، بە هەچ شێوەیەك پارەی دەستبکەوتبووایە، سڵی نەدەکردەوە.

ڕۆژی دووەم، کاتێك (جاك جیرۆد) سەرپەرشتی کرێکارەکانی دەکرد، یەکێکیان، کە ناوی (فنسانت) بوو، لێی نزیك بووەوەو، داوای مۆڵەتی لێکرد، بەڵکو ڕێگەی بدات، بچێتەوە ماڵ، چونکە ژنەکەی نەخۆشە، بەڵام (جاك جیرۆد) داواکەی ڕەتکردەوەو، ڕێگەی نەدا، چونکە ڕێنماییەکانی خاوەن کارگە، ئەوەیان ڕەتدەکردەوە، کە بەر لە تەواوبوونی ماوەی کارکردن، کرێکارەکان دەست هەڵبگرن و، بچنەوە ماڵ.

(فنسانت)یش نەیتوانی بچێتە لای خاوەن کارگە، چونکە ناوبراو نەهاتبووە کارگە، بۆیە هیچ چاری نەما، ئەوە نەبێت، داوا لە (حەننە) بکات، کە ئەو ڕێگەی دەرچوونی بدات، چونکە ئەو پاسەوانی کارگەیە، (حەننە)ش سەرەتا ڕەتی کردەوە، دەرگای

چوونەدەری بۆ بکاتەوەو، ڕێگەی ڕۆیشتنی بدات، بەڵام (فنسنانت) زۆری لەگەڵ گوت، بەمە بەسەر سۆزی (حەننە)دا زاڵ بوو و، دڵی نەرم کرد، بۆیە (حەننە) دەرگای بۆ کردەوەو، (فنسنانت) ڕۆیشت.

کاتێك (جاك جیرۆد) بەو کارەی (حەننە)ی زانی، لە سەرەنجامی خراپی ئەو کارەی ئاگاداری کردەوە، لەو کاتەدا خاوەن کارگەش هاتە کارگەو، بینی (فنسنانت) لە دەرەوە دەڕوات، زانیشی (حەننە) ڕێگەی پێداوەو، دەرگای بۆ کردۆتەوە، بۆیە بە (حەننە)ی گوت:

- (دەبوو دەرگا بۆ فنسنانت نەکەیتەوە، ئەویش نەدەبوو بێ پرس بڕوات، بەڵام کە ئەوەی کرد، منیش ناچارم دەری بکەم و، نەیەڵم بێتەوە سەرکار، تا ببێتە پەند بۆ بێجگەی خۆی)!

(حەننە) نەیتوانی وەڵامی بداتەوە!

(جیل لابرۆ)ی خاوەن کارگە، پیاوێك بوو، گرنگی زۆری بە کارەکەی خۆی دەدا، منداڵێکی هەبوو، ناوی (لوسیان)بوو، دایکی مردبوو، باوکی ڕەوانەی لای خوشکەکەی کردبوو، لە لادێ و، مانگی جارێك سەردانی دەکرد، ئیتر کاتەکەی تری هەموو بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان تەرخان دەکرد، بۆ ئەوەی ئایندەی خۆی و ئەو منداڵەی پێ زامن بکات.

(جیل لابرۆ) هاتە ژوورەکەی خۆی و، (جاك جیرۆد)یشی لەگەڵدا بوو، (جیل) گوتی:

- (من هەڵەم کرد، کە هاتم ژنێکم کردە پاسەوانی کارگە)!

(جاك جیرۆد) وەڵامی دایەوە:

ـ (ڕاست دەکەیت.. ئەو ژنە ناتوانێت بەو کارە هەڵسێت)!

ئینجا خەزنەدارەکە بە کۆمەڵێك پارەو سەنەدەوە هاتە ژوورو، خستنیە سەر مێزەکەی (جیل لابرۆ).. (جاك جیرۆد) ویستی بچێتە دەر، بەڵام (جیل لابرۆ) پێی گوت:

ـ (بووەستە، تا خەزنەدارەکە لە حیساباتی خۆی دەبێتەوە).

پاش ئەوە، کە خەزنەدارەکە تەواوبوو و، چووەدەر، هەردووکیان بە تەنیا مانەوە، (جیل لابرۆ) بە (جاك جیرۆد)ی هاوکاری گوت:

ـ (من لە بیری داهێنانی ئامێرێکی نوێ دام، ئەگەر سەربکەوم، قازانجێکی گەورەم دەست دەخات).. داواشی لێ کرد، کە لە تەواوکردنی ئەو ئامێرە تازەیە یارمەتی بدات، بەمە دەیکاتە هاوبەش و پێنج یەکی قازانجەکانی ئەو ئامێرەشی پێدەدات، هەروەها پێی گوت:

ـ (تۆ تەنیا ڕۆژانە دوو کاتژمێر لە ژوورەکەی من کار بکە، تا هیچ زانیاریەکی لەمەڕ ئەو داهێنراوە نوێیە، نەچێتە دەر).

(جاك جیرۆد) بە سوپاسەوە ڕازی بوو و، بەرەو ژووری (حەننە) هات، بۆ ئەوەی پێی بڵێت، کە خاوەن کارگە چاوەڕوانی دەکات.. لە بیری خۆیشیدا دەیگوت: (ئەگەر بتوانم هەموو قازانجەکە بۆ خۆم مسۆگەر بکەم، بۆچ بە پێنج یەك ڕازی بم؟ ئەگەریش هەموو قازانجەکەم دەستکەوت، ئەو کاتە دەبمە خاوەنی سامانێکی زۆرو، حەننەش دێنم)! ئینجا بە مۆنییەوە پێکەنی و، بەرەو کاری خۆی چوو.

(حەنـنە) هاتـە ژووری خـاوەن كارگـە، داوای لێـبووردنی لـێكرد، كـە ڕێگەی (فنسنانت)ی داوە بڕوات و، گێڕایەوە، كە چۆن سۆز بەسەریدا زاڵبووە، بـۆ ئـەوەی یارمـەتی ئـەو دامـاوە بدات، بۆ ئەوەی بچێت ژنە نەخۆشەكەی ببینێت، بەڵام (جیل لابرۆ) بەم قسانە دڵی نەرم نەبوو و، پێی گوت:

- (پێدەچـێ مانـەوەت لـەم كارگەیـەدا مەحاڵ بێ، چونكە تۆ حەزت لە زۆربڵێییەو، منیش حەزم لە یاساو كارڕێكییە)!

لـێرەدا خەزنەدارەكـە جارێكی تر هاتەوە ژوورو، بە (جیل لابرۆ)ی گوت:

- (گـەورەم.. تكـا دەكـەم، فـەرمان بـەو ژنـە بكەیـت، كـە جارێكی تر نـەوت نەهێنێـتە نـێو ئـەو كارگەیـە، چـونكە ئـەو لـە مەترسییەكانی نەوت بێ ئاگایە)!

بەمــە (جــیل لابــرۆ) لــە شــوێنەكەی خــۆی هەڵســایەوەو، بــە سەرسامییەوە گوتی:

- (نەوت هێنانە نێو ئەو كارگەیە)؟!

(حەننە) دیسانەوە داوای لێبووردنی كردو، گوتی:

- (مـن ئاگـاداری ئـەوە نەبوومـە، تـۆ هێـنانی نەوتـت بـۆ نـێو ئـەو كارگەیە یاساغ كردبێت)!

بەڵام (جیل لابرۆ) پێی گوت:

- (بەداخـەوە پێت دەڵێم هەڵەكەت گەلێ گەورەیە.. بۆیە بە تەنیا تا كۆتایی ئەو مانگە لەو كارگەیە دەمێنیتەوە).

- (کەوابێت تۆ لەو کارگەیە دەرم دەکەیت، کە لە گەرمەی کارکردندا لە ئەنجامی تەقینەوەی یەك لە ئامێرەکانی، مێردەکەمی تیا کوژرا؟! تۆ دەتەوێت دەرم بکەیت.. ڕۆزیم ببڕی و، مندالّەکانم دەربەدەر بکەیت؟! بەلاّم باش بزانە: دوای ئەوەی من دەردەکەیت، خۆشی لە خۆت نابینیت)!

(جیل لابرۆ) بەو قسانەی (حەننە) کارتێکراو بوو، بۆیە پێی گوت:

- (من دەرت ناکەم.. بەلاّم وا هەست دەکەم، هەڵەم کردووە لەوەی، کە بۆ پاسەوانێتی هەڵم بژاردووی، لە کاتێکدا ئەم کارە هەر بۆ پیاوان باشە، بۆیە دەتگۆڕم، بەلاّم ناهێڵم بێکار بیت و، لە کۆتایی مانگدا، کارێکی گونجاوت بۆ دەدۆزمەوە).

- (نەخێر گەورەم.. تازە ئەم کارگەیە بۆمن ڕەش بوو و، بڕیارم دا بەجێی بهێڵم).

دوای ئەم قسەیەی، (حەننە) بە گریانەوە ڕۆیشت و، (جیل لابرۆ) بە خەزنەدارەکەی گوت:

- (من بەزەییم بەو ژنە دێتەوەو، وەکو خزمەتکاری خوشکەکەم دایدەمەزرێنم).

خەزنەدارەکە گوتی:

- (پەلە مەکە گەورەم.. ئەوەت لە بیر بێت، کە ئەو ژنە کەمێك پێش ئێستا هەڕەشەی لێکردی، ئەوە قینی لێتە)!

(جیل لابرۆ) ڕووی قسەکانی گۆڕی، پرسیاری کرد:

- (ئێستاکە ئەو پارەیەی لە نێو سندوقدایە، چەندە)؟

- (ئێستاکە ٧١٢٣ فرەنك و ٣٠ سەنت لە نێو سندوقدایە، دوایێش بۆتی دێنم، تا بیخەیتە نێو سندوقی خۆت و، لێپرسراویەتیەکەی لەسەر من نەمێنێت).

هەرچی (حەننە)شە لە ژوورەکەی خۆیدا مایەوەو، بەوەی بەسەری هات، هەر دەگریا، کاتێکیش کرێکارەکان ڕۆیشتن، (جاك جیرۆد) هاتە لای و، هەواڵی لە کاردەرکردنەکەی پێ ڕاگەیاند، ئینجا لێی پرسی:

- (سەری مانگ چی دەکەیت و؟ بە تەمای بۆ کوێ بچیت)؟

(حەننە) وەڵامی دایەوە:

- (بڕیارم داوە سەفەر بکەم).

- (بەڵام ئایا دوای سەفەرکردنی خۆت، بیر لە چارەنووسی من ناکەیتەوە)؟

- (من دڵنیام، دوای ئەوەی لێك جیا دەبینەوە، تۆ منت لەبیر دەچێتەوە)!

- (گوێ بگرە حەننە.. من سوێندت بۆ دەخۆم، کە بەم زووانە نیازمە بتخوازم.. خۆ ئەگەر ئەوەش ڕەتبکەیتەوە، ئەوا دوو منداڵەکانت دووچاری ئازارو مەینەتی دەکەیت، بەڵام ئەگەر شووم پێ بکەیت، ڕزگارت دەکەم و، دەبیتە خێزانی من).

(جاك جیرۆد) ڕۆشت و، (حەننە) لە دەریای بیرکردنەوەی خۆیدا ڕۆچوو، وای لێ هات لەگەڵ خۆی دوا: (ئەو پیاوە دەیەوێت ئاسوودەییم پێ ببەخشێت و، ئایندەی دوو منداڵەکانم زامن بکات،

ئەدی بۆچی ڕەتی بکەمەوە؟ بەڵام.. ئایا گوناهکار نابم؟ چونکە من سوێندم بۆ مێردەکەم خواردووە، کە دوای ئەو شوو نەکەمەوە)!

٣- (نامەکە):

(جیل لابرۆ) لە ژوورەکەی نێو کارگەی دەخەوت و، لەو ژوورەی دوور نەدەکەوتەوە، تەنها ئەو کاتە نەبێت، کە بۆ سەردانی کوڕەکەی دەچووە لادێ، ئەو کاتە لە دەرگایەکی بچوك دەچووە دەرەوەو، کلیلەکەی بەخۆی بوو.

بەڵام (جاك جیرۆد) وای لێهات، هەمیشە بیرکردنەوەی لەسەر داهێنانە تازەکەی (جیل لابرۆ) بێت.. بۆیە ڕۆژێکیان بە شڵەژاوییەوە هاتە کارگە، (حەنـنە) هەستی بەو شڵەژاوییەی کردو، لێی پرسی:

- (ئەوە چیتە)؟!

وەڵامی دایەوە:

- (هیچم نییە.. دەمووویست بڵێم...)، بەڵام قسەکەی تەواونەکردو، ڕۆیشت.. ئەوەندە هەیە، تا ون بوو، دەیگوت: (ئێوارە یەکتر دەبینینەوە)!

ئینجا هاتە نێو ژوورەکەی (جیل لابرۆ) و، خەریکی داهێنراوەکەی بوو، هەوڵی دەدا شڵەژانەکەی بشارێتەوە.

(جـيل لابـرۆ)ش لـە ژوورەوە بـوو، خـەریکی نووسـینی چـەند نامەیـەك بـوو، هـەر لەوکاتەدا خەزنەدارەکەش هەندێ پارەی پێ بوو و، هاتـەژوور.. (جیل لابرۆ) داوای لێکرد، کەمێك چاوەڕێ بکات، تا لە نووسینی نامـەکانی دەبـتەوە، بۆیـە خەزنەدارەکـە چووە دەر، بـەڵام (جاك جیرۆد) کە باسی پارەی بیست، مووچڕکی بە لەشدا هات.

هـەر لەوکاتـەدا (حەنـنە)ش هاتـە ژوور، نامەیەکی بە (جیل لابرۆ) دا، ناوبراو هەرکە خوێندییەوە، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو، گوتی:

ـ (کوڕەکەم لە بارێکی ترسناك دایە، دەبێ هەر ئێستا بڕۆم).

بۆیـە فـرمانی بـە (حەنـنە) کـرد، ئۆتۆمبێلەکەی بۆ ئامادە بکەن و، داوای لـە (جـاك جـیرۆد)یـش کـرد، کاغـەزو وێـنەکانی داهێـنراوە نوێـیەکەی بـۆ کـۆ بکاتـەوە، تـا بـیخاتە نـێو قاسـەکەی، ئینجا بـانگی خەزنەدارەکەی کردو، پێی گوت:

ـ (چەندت هێناوە)؟

وەڵامـی دایـەوە: (١٢٧ هـەزار فـڕەنکم لـە بانق وەرگرتوودو، ١١ هەزار فـڕەنکی تریشـمان هەبوو، پێنـج هەزار فڕەنکم لێ هەڵگرتووە، ئەوەی مـاوە ١٣٣ هـەزار فـڕەنکەو، بـە کۆکـردنەوە لەگەڵ ئەوەی لە قاسەکەی تۆ هەیە، هەموو پارەکە دەکاتە ١٩٠ هەزارو، ٢٥٣ فڕەنك).

(جیل لابـرۆ) پارەکـەی وەرگـرت و، بـێ ئەوەی بیژمێرێت، یەکسەر خستـیە نـێو قاسەکەی، هەروەها کاغەزو وێنەکانی داهێنانەکەشی، لە (جـاك جیرۆد) وەرگرت و، ئەویشی لە نێو قاسەکەی خست، دەرگاکەی داخست، پاش ئەوە ڕووی بۆ (حەننە) وەرسوڕاندو، پێی گوت:

- (بڕوا بکە، من نایەڵم بێکار بیت، جا تکا دەکەم، ئەوەی ڕووی دا، چۆن من لە بیرە خۆمم بردۆتەوە، ئاوا تۆش لە بیرە خۆتی بەرەوە).

(حەننە) بۆ ئەو هەموو سۆزو دڵنەرم بوونەی سەری سوڕماو، وەڵامی نەدایەوە، بەڵام خەزنەدارەکە لە (حەننە) ڕادەماو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: (ئەم ژنە بەرامبەر بە بەڕێز جیل لابرۆ قین لە دڵە، بۆیە هیچ گومانم نییە، تۆڵەی خۆی لێ دەکاتەوە)!

دوای ئەوە (جیل لابرۆ) ڕێنماییەکانی خۆی ئاراستەی کرێکارەکانی کردو، سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو، کارگەی جێهێشت.

دوای ڕۆیشتنی (جیل لابرۆ)، (حەننە) (جاك جیرۆد)ی وەستاندو، لێی پرسی:

- (ئەم بەیانییە بە نیازبووی چیم پێ بڵێی)؟

(جاك جیرۆد) شڵەژایەوەدو، گوتی:

- (ناوێرم بە قسە بیڵێم.. بەڵام نامەیەکت بۆ دەنووسم، تیایدا مەبەستمت بۆ ڕوون دەکەمەوە).

- (بەڵام ئەم شڵەژانەت دەمترسێنێت)!

- (نا مەترسێ.. پرسیاری هیچیشم لێ مەکە.. چونکە ئەوەی بە زمان ناوێرم بیڵێم، بۆتی دەنووسم).

پاش ئەوە (جاك جیرۆد)، (حەننە)ی جێهێشت و، بە هەوڵدانێکی زۆر بۆ شاردنەوەی شڵەژاوییەکەی، چوو لەگەڵ هاوڕێکانی نانی نیوارەی خوارد، دوای ئەوەی لە چێشتخانەش هاتەدەر، بەرەو کارگە هاتەوە، بەڵام بەرەو دەرگا گەورەکەی نەهات، بەڵکو ڕووی کردە ئەو

دەرگا بچوکەی، کە (جیل لابرۆ) پیایدا هاتووچۆی دەکرد، ئینجا سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، کە دڵنیابوو لەوەی، کەس چاوی بەسەریەوەی نییە، لە دەرگاکە نزیك بووەوە، پارچە مۆمێکی لە گیرفانی دەرهێناو، کلیلی دەرگاکەی لەسەر گرتەوە، ئینجا بە پەلە گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی.

لە هەمان ئەو کاتەدا، (جیل لابرۆ) گەیشتە ماڵی خوشکەکەی لە لادێ و، لە تەندروستی (لوسیان) دڵنیا بووەوە، خوشکەکەی پێی گوت: (لوسیان ئێستاکە باش بۆتەوەو، مەترسی لەسەر نەماوە).. بۆیە (جیل لابرۆ) گوتی: (کەوابێت، بەیانی دەگەڕێمەوە کارگەو، بۆ کاتژمێر دەی شەو، دەگەمەوە ناوی).

خوشکەکەی پرسیاری ئەوەی لێکرد، کە بە چییەوە خەریکە، ئەویش هەواڵی داهێنانە نوێیەکەی پێداو، پێی گوت: (بەم کارەم ملیۆنەها فرەنکم دەست دەکەوێت، ئەوەش ژیانێکی پڕ لە خۆشی بۆ لوسیان مسۆگەر دەکات).

خوشکەکەی پێی گوت:

ـ (بەڵام دەبێ ئەو کارەت زۆر بە نهێنی بکەیت، مەبادا یەکێك لێتی بدزێت و، بۆ خۆی ببات).

ـ (دڵنیا بە خوشکێ.. من بە تەنیا کار لەو پڕۆژەیەم دەکەم.. ئەوەی تیایدا یارمەتیشم دەدات، تەنیا یەك کەسە، ئەویش جاك جیرۆدە، کە پێشتر لە بارەی دڵسۆزی و زیرەکی ئەوەوە زۆرم بۆت باس کردووە).

- (بانی نهێنی داهێنانەکەشت بۆ باسکردووە)؟

- (بەڵێ.. چونکە ناچار بووم، دەبوو یەکێك یارمەتیم بدات، ئەویش لە دروستکردنی ئەو ئامێرە نوێیەدا هاوکاریم دەکات و، یارمەتیەکی باشم دەدات، منیش بڕیارم داوە: پێنج یەکی قازانجەکانی پێ بدەم).

ئینجا هەواڵی (حەننە)ی پێدا، خوشکەکەی بۆی غەمگین بوو، بەلام (جیل لابرۆ) پێی گوت: (غەمگین مەبە.. بەم زووانە، حەننە دەنێرمە خزمەتت، لە کاروباری ناوماڵدا یارمەتیت دەدات و، دەبتە هۆی سێبوریشت، جگە لەوەش کوڕێکی هەیە، لە تەمەنی لوسیانە).

- (بەلام برام.. من بە تەنیا نیش و کارەکانی ماڵم پێدەکرێت).

- (ئەوە دەزانم.. بەلام تکایە داواکەم ڕەت مەکەوە، بۆ ئەوەی بتوانم شتێك بۆ ئەو ژنە داماوە بکەم، ویژدانم پێی ئاسوودە بێت، چونکە مێردەکەی لە کارگەکەی مندا تیاچوو).

خوشکە بەمە ڕازی بوو.

هەرچی لە نێو کارگەشە، (حەننە) لە ژوورەکەی خۆیدا بوو، بیری لە منداڵەکانی دەکردەوە، خزمەتکارەکە لە دەرگای دا، بۆ ئەوەی ئاملی ژووری (جیل لابرۆ) ببات، پاکی بکاتەوە، بە (حەننە)ی گوت: (ئەمە چییە وا تێکچووی؟ نەخۆشی)؟

- (نەخێر).

- (ئەدی بڕیاری چیت دا؟ ئایا دوای کۆتایی مانگ هەر لەو شارە دەمێنییەوە)؟

- (نازانم).

- (بەڵام بەڕێز جیل لابرۆ بەر لە ڕۆیشتنت یارمەتیت دەدات).

- (تکا دەکەم، کلیلەکە بەرەو، ژوورەکە پاکبکەرەوە، ئیتر چیتر پرسیارم لێمەکە).

خزمەتکارەکە ڕۆیشت و، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: (حەننە قینێکی گەورەی لە خاوەن کارگەیە).

دوای ئەوە (حەننە) هەڵسا نەوتەکەی لە چەند شوشەیەکی بچوك بکات، لە کاتێکدا ئەو خەریکی ئەم کارەی بوو، خەزنەدارەکە هاتە ژوورەکەی و، کە بەم شێوەیەی بینی، لێی پرسی: (ئەوە تا ئێستاش نەوت بەکاردێنی)؟!

- (من بەتاڵی دەکەمە شوشەی بچوك، چونکە مولکی خۆمەو، پاش ئەوەی کارگە جێدەهێڵم، بۆ خۆم بەکاری دەهێنم، بۆیە با کەس لە ئاگرکەوتنەوە نەترسێت).

خەزنەدارەکە بە قین لێهەلگرتنەوە چووە دەرەوە.

ئێوارە (جاك جیرۆد) هاتە ژوورەکەی (حەننە)، (جۆرج)ی کوڕی یاری بە ئەسپە دروستکراو لە کاغەزو دارو پەڕۆکەی دەکرد، شوتێکی لێدا زگی دڕی، (جۆرج) هەوڵی دا، شوێنە دڕاوەکەی زگی ئەسپەکەی بشارێتەوە، بۆیە هات چی دەستی کەوت، لە کاغەز خستیە نێو زگی ئەسپەکەی، بەڵام هێشتا کەلێنێکی هەر مایەودو، تەواو پڕ نەبوویەوە.

(جاك) هاتە پێش و، لەگەڵ ئەوەی نامەیەکی دایە (حەننە)، پێشی گوت: (ئایندەی دوو منداڵەکانت و، ئایندەی خۆشمان هەردووکمان لە بەر دەستی تۆ دایە).. ئینجا بە خێرایی چووە دەر.

(حەننە) نامەکەی کردەوەو، خوێندییەوە:

((خۆشەویستم حەننە:

گەیشتوومەتە داهێنانێکی گەورە، دەمکاتە خاوەن ماڵ و سامانێکی زۆر، ئێستاکە سەد هەزار فرەنکم هەیە، لە دروستکردنی ئەو داهێنراوە نوێیە خەرجی دەکەم، جا ئێستا ئایندەی من و تۆو دوو منداڵەکانت بە تۆوە بەستراوە، بزانە من کاتژمێر پانزدی ئەمشەو لە نزیك پردی شارلتۆن چاوەڕوانیت دەکەم، خۆت و جۆرجی کوڕت وەرن، تا بچینە دەرەوە، کە لە وێدا ئاسوودەیی چاوەڕێمان دەکات، بەڵام ئەگەر ئەوە ڕەتبکەیتەوە، ئەوە مانای وایە خۆت لە گێژاوی ئازارو ناڕەحەتی دەخەیت و، لە ژێر ڕەحمەتی ئەوە دەمێنیەوە، کە لە کارگەدا دەرت دەکات.

٧ی ئەیلولی ١٨٦١

جاك جیرۆد))

(حەننە) دوای ئەوە کەوتە بیرکردنەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: (بێگومان جاك ئەقڵی لە دەست داوە، ئەگینا ئەو هەموو پارەیەی لە کوێ بوو، ئەدی لەم کتوپڕییە مەسەلەی ئەو داهێنانە نوێیەی چییە)؟!

وای گومان برد، (جاك) دەیەوێت بەلایەكی بەسەر بێنێت، بۆیە تورەبوو، نامەكەی بە دەستی خۆی گەچراند و، فرێی دایە سەر زەوی، جۆرج هەڵیگرتەوەو، كەلێنی زگی ئەسپەكەی پێ پڕ كردەوە، بەلام دایكی هەستی بەمە نەكرد.

٤. (سووتانی كارگە):

(جاك جیرۆد) لە كاتژمێر یانزەی شەو لە لای پردی شارلتۆن وەستابوو، ئەو ڕەشەبایەی دەهات بێزاری نەدەكرد، بەلام لە دڵی خۆیدا دەیگوت: (دەزانم ئەو ژنە نایێت)! كاتێكیش ماوەیەكی زۆر چاوەڕووانی كرد، لە دڵی خۆیدا گوتی: (بێ و نەیێ، یەك شتە، من هەر ئەوە دەكەم، كە بە نیازم بیكەم، ئەو لە بەرامبەر ئەو خۆشەویستییەی من لە بۆی، بە ڕق و قین وەلامم دەداتەوە، دەبا خۆشەویستی منیش بۆ ئەو بمرێت و، لە جێی ئەو، ماڵ و سامانم خۆشبووێت).

بەلام لەپڕ نامەكەی بیرهاتەوەو، ڕاچڵەكی.. پاش ئەوە گەڕایەوە كارگە، لە دەرگا بچوكەكە چووە ژوور، كە كلیلێكی بۆ دروست كردبوو، بینی لە ژووری (حەننە) ڕووناكی هەیە، ئینجا هاتە ئەو كۆگا بچوكەی نزیك ژوورەكەی (حەننە)، چوار شوشە لەو شوشە بچوكە پڕ نەوتانەی (حەننە)ی هێنا، ئینجا چووە ژووری دارتاشییەكەو، دوو شووشە نەوتی بەسەر دارو ئامێرەكانی ئەوێدا

ڕژاند، ئێـنجا هاتـەوە ژووری خـاوەن کارگـە، بـە زیـرەکی دەرگـای ...ـەکەی کـردەوە، ئـەو پارەیـەی تـیای بوو، لەگەڵ کاغەزو وێنەکانی ...هێـنانە نوێیەکەی ناویی دزین و، دوو شووشە نەوتەکانی تری لەوێ ڕژانـد، ئینجا گەڕایەوە ژووری دارتاشیەکە، یەکەمجار ئەوێی سووتاند و، بەم شێوەیە ئاگر لە کارگەکە کەوتەوە.

٥. (تاوانی کوشتن):

(جیل لابـرۆ) کاتژمـێر دوانـزەو نـیوی شـەو گەیشتـەوە کارگەکـەی خۆی، ئەمەش بەهۆی ئەو گەردەلولەی لە ڕێگا بووە هۆی دواخستنی، ئـەو کاتـە (جـاك) ژووری کارگەکـەی ئاگـر تێبەردابوو، دەهاتە ژووری (لابـرۆ) تـا ئـەویش بسووتێنێ، بەڵام ئاگرەکەی تێبەرداو تێیبەرنەدا، (جیل لابـرۆ) گەیشتـەوە نووسـینگەکەی، هەسـتی کـرد ئـەم ئاگرە بە ڕێکـەوت دروست نـەبووە، بەڵکو یەکێك کردوویەتیەوە، چونکە بینی دەرگـای کارگەکـەی کـراوەیە.. (جـاك)یـش هیـچ چاری نەما بۆ ئەوەی ڕێ لـە هـاواری خـاوەن کارگـە بگرێـت، هێرشـی بـۆ هێنا، خەنجەرێکی لەسەر سینگی قایم کردو، کوشتی، لەو ساتەدا (حەننە)ش هاتەژوور.

(حەنـنە) زانـی تۆمـەتی ئـەو کوشـتن و، ئاگرکەوتـنەوەیە دەخرێتە ئەستۆی ئەو، بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی: (بەڵام من بەڵگەی بێتاوانی خۆمـم هەیـە، ئـەویش نامەکەیـە، بـەڵام لـە کوێـم دانـا؟ پێویستە بە خێرایی بیدۆزمەوە).

ئینجا بە پەلە بەرەو ژوورەکەی خۆی هاتەوە، بۆ ئەوەی لە نامەکە بگەڕێت، لەو ڕێگەیە بیستی، خەزنەدارەکە بە هەندێ لە کرێکارەکان دەڵێت: (بێگومان ئەو ژنە کەڵلە شەقە ئاگری لەو کارگەیە بەرداوە، چونکە ئەو هەرەشەی تۆڵە کردنەوەی لە بەڕێز لابرۆ کردبوو).

(حەننە) خێراتر بەرەو ژوورەکەی هاتەوە، بەڵام کە نامەکەی نەدۆزیەوە، خەریك بوو، شێت دەبوو، چونکە ئەمە تاکە بەڵگە بوو، لەسەر بێ تاوانی ئەو، هەرچی (جۆرج)یشە لە کونجێکی ژوورەکە دانیشتبوو و، بە توندی ئەسپە داریـنەکەی خۆی بە سینگەوە گرتبوو.

(جاك) سەرەتا ویستی ڕابکات، بەڵام دواتر بڕیاری دا بمێنێتەوەو، (حەننە) بەو کارەی تاوانبار بکات، چونکە بەڵگەی زۆری لەسەر ئەو ژنە هەیە، بۆیە هاتە نێو کرێکارەکانی تر، کە بە دەوری پیاوانی ئاگرکوژێنەوە کۆببوونەوەو، جارجارە دەیگوت: (بێگومان ئەو ژنە کەڵلە شەقە ئەو کارەی کرد)! ئینجا لە دڵی خۆیدا گوتی: (باش وایە ئەوپەڕی دڵسۆزی و ئازایەتی خۆم بۆ ئەو کرێکارانە دەربخەم، تا بەمە ئەو تۆمەتە لە خۆم دوور بخەمەوە، کە حەننە دەیخاتە ئەستۆم).. لێرەدا بیرۆکەیەکی بۆ هات، بۆیە هاواری کرد: (دەچم سندوقەکە ڕزگار دەکەم) و.. بە ئازایەتی خۆی هەڵدایە نێو ئاگری ژوورەکەی (لابرۆ)، لەوێش بە زۆر لەخۆکردنەوە، بە دەنگێکی خەفەتاویـیەوە هاواری کرد: (ئەوەتا تەرمێك)!! ئەوەی گوت و،

...مەكەی بۆ كرێكارەكان، ڕاكێشايە دەرەوە.. كە خەزنەدارەكە چاوی پێكەوت، هاواری كرد: (ئەوە تەرمی سەرۆكی كارگەمانە)!!

(جاك) وای پیشاندا لەو قسەیەی خەزنەدارەكەیان نەگەیشتووە، بۆیە خۆی هەڵدایەوە نێو بڵێسەی ئاگرەكەو، وای دەرخست دەیەوێت سندوقی پارەكە لە سووتان ڕزگار بكات.. بەڵام دوای كەمێك هاواری كرد: (فریام كەون.. لە نزیك سندوقەكەمو، خەریكە ئەخنكێم).

كرێكارەكان هەوڵیان دا فریای بكەون، بەڵام دیواری ژوورەكە كەوت و، بووە ڕێگر لەو هەوڵەیان، ئەویش دەنگی نەما، بۆیە وایانزانی بووە شەهیدی دڵسۆزی و ئازایەتییەكەی!!

٦- (لێكۆڵینەوە):

هەوڵی پیاوانی ئاگركوژێنەوە سەری نەگرت و، كارگەكە هەمووی بوویە خەلوز و خۆڵەمێش.. خەزنەدارەكە دەیگوت: (بێگومان ئەمە حەننە فۆرتیە بوو، ئەو كارەی كرد)!

سەرۆكی پۆلیس گوێی لەم قسەیەی بوو، لێی نزیك بوویەوەو، پرسی:

- (تۆ كێیت)؟

- (من خەزنەداری ئەو كارگەیەم.. وەرە گەورەدم سەیری تەرمی سەرۆكەكەمان بكە)!

سەرۆكی پۆلیس لەگەڵی چوو، تەرمەكەی بینی و، پێی گوت:

- (تۆ کێ بەم کارە تاوانبار دەکەیت)؟
- (پاسەوانی کارگەکە گەورەم.. حەننە فۆرتیە).
- (گوێم لێت بوو، دەتگوت: کوژراوێکی تریشمان هەیە)؟
- (بەڵێ.. ئەو جاك جیرۆدە، کە لەبەر دڵسۆزی خۆی چووە ناو ئاگر، لەپڕ دیواری بەسەردا کەوت و، مرد)!
- (ئەدی بە چ بەڵگەیەك حەننە بەم کارە تاوانبار دەکەیت)؟

خەزنەدارەکە دەستی کرد بە باسی شووشە نەوتەکان و، ئەو هەڕەشەیەی حەننە لە (جیل لابرۆ)ی کرد، لەگەڵ چۆنیەتی چوونی (جیل لابرۆ) بۆ لادێ، بۆ بەسەر کردنەوەی کوڕەکەی.. سەرۆکی پۆلیس پێی گوت:

- (جا گەڕانەوەی جیل لابرۆ لەو شەوەدا بە تایبەت چۆن دەبینی)؟
- (بێگومان لە تەندروستی کوڕەکەی دڵنیا بووە، بۆیە کاتی گەڕانەوەکەی پێشخستووە).
- (ناونیشانی خوشکەکەی دەزانی)؟
- (بەڵێ گەورەم).
- (کەوابێت نامەیەکی بۆ بنێرەو، لەم کارەساتەی ئاگادار بکەوە).

خەزنەدارەکە ئیتر ڕۆیشت، سەرۆکی پۆلیسیش ڕاپۆرتەکەی خۆی نووسی و، ئەوەی تیا چەسپاند، کە زۆرینەی کرێکارەکان، لەسەر ئەوەنە، کە (حەننە) ئەم کارەی کردبێت.. هەرچی (حەننە)شە لەو کاتەدا لەگەڵ کوڕەکەی کارگەی جێهێشتبوو، چونکە لەوبڕوایەدا بوو، کە (جاك) تۆمەتەکە دەخاتە ئەستۆی ئەو.

ئەگەر بۆ کارگەش بگەڕێینەوە، دەبینین لەسەر داوای سەرۆکی پۆلیس، (دادوەری لێکۆڵینەوە) هاتۆتە ئەوێ، یارمەتیدەرەکانی ئەو

[illegible]ابیان لـە بـەر دەسـتیدا کۆکـردۆتەوە، کـە (حەنـنـە) نـەوتی [illegible]وون.. ئیـنجا (دادوەر) خەزنەدارەکـەی بانگکـرد، کـە دووبـارە [illegible]راو پەنجـەی تـاوانی بـۆ (حەنــنە) درێژکــردو، ئــەو قسـانەی ([illegible]نە)ی بۆ گێڕایەوە، کە لـە کاتێکدا خـاوەن کارگە ویستی دەری [illegible]ات، پـێی گوتبوو.. بـەڵام دادوەر گوتـی: (بـەس تاوانـبار پێویسـتی [illegible]وە نـەبووە، ئاگـر لە ژووری نووسینگە بەربدات، چونکە ئەو ئاگری [illegible] هۆڵی نامێرەکان بەردابوو، لەو بارەش ئەو دەیزانی ئاگرەکە خۆی دەگاتـە، ژووری نووسینگەکە، بـەڵام کـە ئەمـەی کـردووە، ئەمـە ئەوە [illegible]ەر دەخـات، کـە ئـەو مەسـەلەیە دزیشی تـیایە، جـا ئایـا بـێجگەی تۆ، کەسێکی تر بە بوونی پارەی دەزانی لە نێو سندوق)؟

- (بـەڵێ.. ئـەو کاتـەی پارەکـەم دایـە بەڕێـز لابـرۆ، حەنــنە و جـاك جیرۆدیش لەوێ بوون).

(دادوەر) لـە پێشەخۆیدا گوتـی: (جاك جیرۆد)؟! وای گومان برد، کە گەیشـتە دۆزیـنەوەی تاوانــبارەکە، بــەڵام خەزنەدارەکـە توشـی بــێ ئومـێدیی کـرد، کـە پێی گوت: (جاك جیرۆد قوربانی بە گیانی خۆیدا بـۆ ئـەوەی سندوقەکە دەرباز بکات، بەڵام دیواری ژوورەکەی بەسەردا ڕووخاو، گیانی لە دەست دا).

بـەڵام (دادوەر)ەکە بـە گومانـەوە گوێـی لـە قسەکانی ڕاگرت، گوتی: (ئەگـەر حەنـنە فۆرتـیە ئاگـاداربووو، لە بەسەفەرچوونی بەڕێز لابرۆ، ئەدی بۆچی خەنجەری بە دەست دەگرت)؟!

لێرەدا یەك لە كرێكارەكان هاتە ژوورو، ژنێكی لەگەڵدا بوو، بە (دادوەر)ی گوت: (گەورەم من بەڵگەی تەواوم پێیە، كە حەننە ئەو تاوانەی ئەنجام داوە).

ئەو ژنەی ئەو كرێكارە لەگەڵ خۆی هێنابووی، خاوەنی ئەو دوكانە بوو، كە حەننە نەوتی لێ كڕی بوو، ژنە بە (دادوەر)ی گوت: (حەننە بۆ دوو ڕۆژی لەسەر یەك نەوتی لێ كڕیوم، بە بەهانەی ئەوەی نەوتەكەی ڕۆژی یەكەمی كوڕەكەی ڕێژتوویەتی).. دوای ئەوەش پێی گوت: (حەننە پێمی گوت: پێویستیم بە دوو هەزار فرەنكە).

ئیتر گومان لای (دادوەر) نەما، وای لە لا چەسپا، كە تاوانبار (حەننە)یە، بۆیە فرمانی دەستگیركردنی دەركرد.

لەو كاتەدا، خوشكەكەی بەڕێز (لابرۆ)ش، كە لە نامەیەكدا هەواڵی ئەو كارەساتەی پێگەیەنرابوو، گەیشتە كارگە، خەزنەدارەكە پێی گوت: (كارگە دوو سەد هەزار فرەنك قەرزارە، بەڵام ئەو پارەیە لە لایەن كۆمپانیاكانی زامنكردن (تأمین)ەوە دەدرێتەوە خاوەنەكانیان).

ئینجا ئەو خوشكەی بەڕێز (لابرۆ) چاوی بە دادوەرەكە كەوت و، پێی گوت:

- (گەورەم لەو بڕوایەدا نیمە، ژنێك هەموو ئەو كارەساتەی دروستكردبێت)!

- (بەڵام خاتونەكەم ئەو ژنە ڕایكردووە).

- (لەوانەیە لە ترسان ڕای كردبێت).

- (لەو بڕوایەدا نیم.. چونکە وەکو پێدەچێت، ئەو بە ڤینێکی کۆن ئەو کارەی ئەنجام داوە، بە بەڵگەی ئەوەی، کە دوکاندارەکە دەڵێ: دوو ڕۆژی لەسەر یەك ئەوتی کڕیوە..).

- (بەڵام گەورەم بە پێویستی دەزانم ئەوەت پێ بڵێم، کە برایەکەم لە باری دروستکردنی داهێنراوێکی نوێ بوو، لەو کارەشی کەسێکی ئاگادار کردبوو، ناوی جاك جیرۆدە).

- (بەڵام ئەگەر تۆ ئەو پیاوە تاوانبار بکەیت، ئەوا تۆ بە هەڵەدا چوویت).

- (لە بەر چی)؟!

- (چونکە بۆتە شەهیدی ئازایی و دڵسۆزییەکەی)!

ئینجا (دادوەر) لە بارەی (جاك جیرۆد)ەوە ئەوەی بیستبووی بۆ خوشکی بەڕێز (لابرۆ)ی گێڕایەوە، بۆیە ئەویش بڕوای پێکردو، داوای لێبووردنی لێکرد، کە گومانی هەبوو، ئەو تاوانبارەکە بێت.

٧- (پیاوە ئاینی و وێنەکێشەکە):

(حەننە) چەند فڕەنکێکی کەمی پێ بوو، بۆیە پارچە پەنیرێکی بۆ کوڕەکەی کڕی، دەرخواردی دا، بێ ئەوەی بۆ خۆی تەنانەت پاروویێکیش بخاتە دەمی، هەرچەندە زۆریشی برسی بوو.

پاش ماوەیەك (حەننە) گەیشتە گوندی (شیفری)، پرسیاری لە پیاوە ئاینیەکە کرد، دوای دۆزینەوەی چووە ماڵیان، پیاوە ئاینیەکە

ناوی (فیلکس لۆجیه) بوو، تەمەنی لە سەرووی شەست ساڵی بوو، ئەم پیاوە ئاینییە لەگەڵ خوشکەکەی و خزمەتکارێکی دەژیا.

(حەنـنە) لە ماڵی ئەو پیاوە ئاینییە ڕێزێکی زۆری لێنرا، ژوورێك بە خۆی و کوڕەکەی درا، بۆ ئەوەی تیایدا بە ئاسوودەیی بمێننەوە، (حەننە) لەوێ هێندە ئاسوودە بوو، خەریك بوو، ئەوە لە بیر بکات، کە بەسەریدا هاتبوو.

ڕۆژێکیان لە کاتێکدا خوشکی پیاوە ئاینییەکە لەگەڵ میوانێکیان قسەی دەکرد، کە میوانەکە وێنەکێش بوو، کەسێك هاتە ماڵیان و، ڕۆژنامەیەکی دایە دەست پیاوە ئاینییەکە.

پیاوە ئاینییەکە لە ناونیشانەکانی ڕۆژنامەکە ورد دەبووەوە، یەکەم ناونیشانێك، کە سەرنجی ڕاکێشا بریتی بوو لە : (تاوانێکی ترسناك)!! لەو وتارەدا وەسفی (حەننە) بڵاوکرابووەوە، کە لەگەڵ کوڕە بچوکەکەی ڕایکردووە.

ئیتر هەمووان سەرسام بوون، کە ئەمەیان لە بارەی ژنە میوانەکەیان بیست، بەڵام پیاوە ئاینییەکە بە خوشکەکەی و بە وێنەکێشەکەشی گوت: (ئێوە لەم بارەیەوە هیچ لای ئەو ژنە مەدرکێنن، با نەزانێت ئێمە شتی وەها دەزانین، چونکە ئەو میوانی منەو، بە هیچ شێوەیەك من نامەوێت لای من خراپەیەکی بەسەر بێت، با لە دەرەوە پۆلیس هەر بە دوایدا بگەڕێت).

پاش کەمێك (حەننە) لە خەو هەڵساو، هاتە لای ئامەدەبووان، پیاوە ئاینییەکە لێی پرسی:

. (وا تێدەگەم، تۆ ناتەوێت زۆر لەو گوندە بمێنیتەوە)؟

(حەنـنە) شـڵەژاو، گوتـی: (بـەڵکو نـیازی ئـەوەم هـەبوو، لـێرە بمێنمەوە، بۆیـەش هاتوومـە لای تـۆ، تـا کـارێکم بـۆ بدۆزیـتەوە، بـە هۆیـەوەی بـتوانم ژیانی کوڕەکـەم زامـن بکەم، چونکە من بێوەژنم و، کچێکی شیرەخۆریشم هەیە لە گوندێکی ترە).

. (بـەڵام مـن پێویستیم بـە ناسنامەی تۆیە بۆ ئەوەی کەسایەتی تۆ لای من ئاشکرابێت.. باشە تۆ ناوت چییە)؟

. (حەننە فۆرتیە).

. (لە فۆرتفیلەوەش هاتوویت.. وا نییە)؟

(حەنـنە) ڕاچڵەکی و، گوتـی: (گـەورەم کەوابێـت تـۆ هـەموو شتێك دەزانی)؟!

. (بەڵێ ئەی ژنە داماوەکە.. باشە تۆ چ تاوانێکت هەیە)؟!

. (بـە زۆر و سـتەم و نابەهـەق تاوانـبار کـراوم و، هـەواڵی هـەموو شتێکت پێ ڕادەگەینم).

ئیـــنجا بـــۆ پیاوەئاینیـــیەکەو خوشـــکەکەی و وێنەکێشـــەکەش سەربردەکەی خۆی گێڕایەوە، ئەوەشی پێگوتن، کە چۆن نامەکەی ون کـردووەو، (جـاك) چ تاوانـێکی ئـەنجام داوەو، چـۆن لەبـەر ئـەوەی گومانی لەسەرە ڕایکردووە.

پێدەچوو ئامـەدەبووان هـەموویان بـڕوایان پێکردبێـت.. کاتێکـیش پیاوەئاینیـیەکە هـەواڵی ئـەوەی پـێ ڕاگـەیاند، کـە (جـاك جـیرۆد) مـردووە، (حەنـنە) دەسـتی کـردە گـریان و، گوتـی: (بـەو مـردنەی لـە

منی بردووه، چونکه ئەو ئەگەر بمابووایە لە بەرامبەری من نەیدەتوانی نکۆڵی لەو تاوانەی بکات، بەڵام بەو مردنەی، تازە ئومێدی ئەوەم نەما، بتوانم بێ تاوانی خۆم دەربخەم)!

پیاوە ئاینییەکە پێی گوت: (پێویستە بە پەلە خۆت بگەیەنیتە دادوەران و، پێیان رابگەیەنیت، کە تۆ بێ تاوانی، ئەوەشیان بۆ راقە بکەیت، کە تۆ بۆچی راتکردووە).

- (بەڵام ئەگەر ئەوەم کرد، بەندم دەکەن و، کورەکەم لێ جیادەکەنەوە، منیش بەرگەی ئەوە ناگرم).

لەم ساتەدا چەند سەربازێك، کە کوێخای گوندەکەشیان لەگەڵ بوو، هاتنە ماڵی پیاوە ئاینییەکەو، پێیان گوت: (ئێمە لە ژنێك دەگەرێین، ناوی حەننە فۆرتییەیە، بە سێ تاوانی دزی و، ئاگرکردنەوەو، پیاوکوژییەوە تاوانبارە).

(حەننە) هاتە پێش و، گوتی: (من ئەو ژنەم، کە بە دوای دەگەرێن، بەڵام من بێ تاوانم، دڵنیاتان دەکەم، کە من بێ تاوانم).

بەرپرسی سەربازەکان گوتی: (ئەمە لای من نا خاتوون، ئەم قسانە لە دادگا بکە، چونکە کاری من تەنها ئەوەیە، بە ناوی یاساوە بتگرم).

ئیتر بەرپرسەکە فەرمانی بە سەربازەکانی کرد، دەستی (حەننە) ببەستن و، (جۆرج)ی بچوکیش گریاو، دەیگوت: (دایە گیان مەرۆ.. مەرۆ...).

(حەننە) داوای لە سەربازەکان کرد، بەزەییان پێدا بێتەوەو، رێگەی بدەن، منداڵەکەشی لەگەڵ خۆی ببات، بەڵام پێیان گوت:

(نەمە ڕێپێدراو نییە).. لێرەدا خوشکی پیاوەئایینییەکە لێی نزیک بووەوەو، گوتی: (خەمت نەبێت خاتوون.. کوڕەکەی تۆ بەو پەڕی باشیەوە لەوماڵەدا خزمەت دەکرێت).

منداڵەکە سەیری دایکی کردو، پێی گوت: (دایە گیان لێرەدا بمێنمەوە)؟

دایکی وەڵامی دایەوە: (بەڵێ.. من ئەوەم پێ باشە).

ئیتر (حەننە) برایە دەرو، هاواری دەکرد: (تکایە باسی من بۆ کوڕەکەم بکەن، تێی بگەیەنن، کە بێ تاوانم و، ڕۆژێکیش هەر دەگەڕێمەوە لای).

بەڵام (جۆرج) کە دایکی لە نێو دەستی سەربازەکان بینی، گریانی نەوەستاو، بە لاوازییەوە ئەسپە دارینەکەی گرتە باوەش.

وێنەکێشەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: (دەبێ ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم ڕووداوە بکەمە تابلۆیەك).

حوکمی زیندانی هەتا هەتایی بەسەر (حەننە)دا دراو، خرایە گرتووخانەی (سانت لازار).. چونکە هەرچەندە ڕەتی کردەوە تاوانبار بێت و، گوتی تۆمەتەکان هی (جاك جیرۆد)ن، بەڵام دادوەرەکان بڕوایان پێ نەکرد، گوتیان: (ئەوەی تاوانی وەها ئەنجام بدات، ئاسانە چیرۆکی ئەم نامە ونبووەش دروست بکات).

ئیتر پیاوەئایینییەکەو خوشکەکەی (جۆرج)یان وەکو منداڵی خۆیان بەخێوکرد.

٨ـ (بەرەو ئەمریکا):

(جاك جیرۆد) هەر زیندوو بوو، ڕاستییەکەی ئەوەبوو: کاتێك چووە ناو ژوورەکەو، دیوارەکە کەوت، ئەو هاواری کرد: (فریام کەون)، ئەوەی بۆ ئەوەبوو، ئەوان بە هەڵە ببات، چونکە دەیزانی ئەوان ناتوانن بگەنە ئەوو ڕزگاری بکەن، دوای ئەوەش دەنگی لەخۆی بڕی، ئیتر ئەو هەڵەی قۆزتەوەو، لە دەرگا بچوکەکەی دواوەی کارگە بۆی دەرچوو، لەوەش دڵنیابوو، کە ئەوان وا دەزانن سووتاو، بووە شەهیدی دڵسۆزی و، ئازایەتییەکەی.

دوای ئەم ڕووداوە پرچی بۆیە کردو، جل و بەرگی خۆی گۆڕی و، ناوی خۆی کردە (بۆل هرمان)!! کە ئەو ناوە ناوی برادەرێکی خۆی بوو، پێشتر لەگەڵیدا لە ژوورێك ژیانیان بردبووە سەر، کاتێکیش (بۆل) نەخۆش دەکەوێت و، لە نەخۆشخانەدا دەمرێت، ئەو بەڵگەنامەی مردنەکەی وەردەگرێت، بەڵام دواتریش نایداتەوە کەس و کارەکەی و، لای خۆی گلی دەداتەوە، ئەوەتا ئەمڕۆش ناوی ئەو هاوڕێیەی لە خۆی دەنێت!

(جاك) سواری کەشتی بوو و، بەرەو ئەمریکا ڕێگای گرت، شوێنەکەی شوێنی نەفەری پلە یەك بوو، هەر لەو کەشتیەشدا پیاوێکی ئەمریکی و کچە جوانەکەشی لەو شوێنە پلە یەکە بوون.

کارمەندێکی کەشتیەکە هات، ناوی نەفەرەکانی خوێندەوە، بەمە (جاك) بۆی دەرکەوت، ناوی ئەو پیاوە ئەمریکیە (جیمس مۆرتیمێر) و، ناوی کچەکەشی (نومی)یە.

کاتێکیش کارمەندەکە ناوی (بۆل هرمان)ی خوێندەوە، یەك لە سەرنشینەکانی پلە دووی کەشتییەکە سەرسام بوو؟! لە دڵی خۆیدا گوتی: (بۆل هرمان؟! کوڕە خاڵە میکانیکیەکەم؟! بەڵام ئەو مردووە!! چییە ئەوە ڕێککەوتە؟! چونکە ئەو پیاوە هیچ بە کوڕە خاڵەکەم ناچێت)!

پیاوەکە ویستی (بۆل هرمان)ی ساختە، یان (جاك جیرۆد)ی ڕاستەقینە ببینێت، بەڵام سەرنشینانی پلە دووی کەشتییەکە بۆیان نەبوو بێنە نێو سەرنشینانی پلە یەك، بۆیە داوای لە (مۆرتیمێر)ی ئەمریکی کرد، کە چاکەیەکی لەگەڵ بکات و، پێی گوت:

- (بەڕێزم.. بە یارمەتیت.. دەتوانی بانگی نەفەرێکم بۆ بکەیت لە سەرنشینانی لای ئێوەیە، ناوی بۆل هرمانە، پێی بڵێیت: ئۆفید سۆلیڤۆ دەیەوێت بچێتە لای، چونکە ئەو کوڕی خاڵمە، بەڵام من وامدەزانی مردووە)!

پیاوە ئەمریکیەکە بەم داوایەی (ئۆفید سۆلیڤۆ) ڕازی بوو، ڕۆیشت بە دوای (بۆل هرمان)دا گەڕا، کە دۆزییەوە پێی گوت: (نەفەرێك لە سەرنشینی پلە دووەکانە، ناوی ئۆفید سۆلیڤۆیە، داوات دەکات بچیتە لای و، دەڵێت: تۆ کوڕی خاڵی ئەوی، کەچی تا ئێستا وای دەزانی مردوویت)!

(جاك) هەولّی دا سووربوونەوەی دەمووچاوی بشارێتەوەو، گوتی: (ئۆفید سۆلیڤۆی کوڕە پورم؟! سوپاست دەکەم بەڕێز.. ئێستا دەچمە لای)!

(جاك) ئیتر لە هۆڵەکە هاتە دەرو، یەکسەر بەرەو ژوورەکەی خۆی گەڕایەوە، سەیری دۆسیەکەی (بۆل هرمان)ی کرد، بۆی دەرکەوت، دایکی (بۆل) لە خانەوادەی (سۆلیڤۆ) بووەوەو، هەستی کرد، لە گێژاوێکی وادا کەوت، بیری لێنەکردبووەوە!! ناچار دوای کەمێك ئارەقی نێوچەوانی سڕی و، هات (ئۆفید سۆلیڤۆ) ببینێت.. کاتێك (ئۆفید سۆلیڤۆ) چاوی بە (جاك) کەوت، بە سەرسووڕماوییەوە پێی گوت:

- (تۆ بۆل ئۆنوریـیە هرمانی لە دایك بووی دیجۆنی، کوڕی سیزار هرمان و، کلێر سۆلیڤۆی)؟!

- (بێگومان.. بەڵام تۆ واتدەزانی مردووم.. وا نییە)؟!

- (بەڵێ.. چونکە یەك لە کارمەندەکانی ئەو نەخۆشخانەیەی تۆی تیادا کەوتبوو، پێی گوتم: بۆل هرمان مرد.. دایکیشت لە داخی تۆدا، ساڵێك پاش سەرنانەوەی باوکت، ئەویش کۆچی دوایی کرد)!

- (من ئەوەم زانی و، زۆر غەمم خوارد)!

- (ئێستاش لە خانەوادەی هرمان بێجگەی تۆ کەسی تر نەماوە، هەروەك چۆن لە خانەوادەی سۆلیڤۆش بێجگەی من کەس نەماوە).

- (ڕاست دەکەیت).

- (بەڵام تۆ زۆر گۆڕاوی!! بێگومان ئێستاکە دەوڵەمەندی)؟!

- (بـاری هەبوونـيم خـراپ نيـيە، داهێـنراوێكی نـوێ و گـرنگم داهێناوە، بەڵام ئەدی تۆ چی دەكەیت)؟

- (هەمان كاری جارانم).

- (چ كارێك بوو)؟

- (بۆچی لە بیرت كرد؟! من میكانیكیم).

(جاك) ویستی ڕێـڕەوی قسەكان بگۆڕێت، گوتی: (ئەدی چییە؟ بە دوای كاردا بۆ نیۆرك دەچیت)؟

- (بـەڵێ.. بـە نـیازم لەگـەڵ جـیمس مۆرتـیمـێر كار بكەم، ئەو پیاوە ئەمریكییەی تۆ لە نزیك خۆی و كچەكەی ڕاوەستابووی.. بەڵام ئەدی هەواڵی مارگرێت چییە)؟

- (مارگرێت كێیە)؟!

- (بۆچـی لـەبیرت كـرد؟! ئـەدی ئـەو كچـە نـەبوو، كـە تـۆ خۆشـت دەویست)؟!

- (ئـاه.. هاتـەوە بـیرم!! خـەریك بوو ئەو كچەم لەبیر دەچوودوە، كە لە ڕۆژگارێكی دووردوەبوو، خۆشم دەویست)!

لـێرەدا گومـان كەوتە دڵی (ئۆفید سۆلیڤۆ)!! ئینجا هەستی كرد ئەم كابـرایەی پێشی پرچی بۆیە كردووە، چونكە ئارەقی نێوچەوانەكەی كـەم كـەمـە ڕەنگەكـەی شـیدەكردەوە، ئـیتر هیچ گومانی نەما، كە ئەم پیاوە بـە سـاختە نـاوی كـوڕە خاڵەكـەی ئـەوی لـە خـۆی نـاوە!! بۆیـە بڕیاری دا، ئەو ڕاستییە ئاشكرا بكات.

دوای ئـەوە، لە بارەی (جیمس مۆرتیمێر)ەوە قسەیان کرد، (ئۆفید) بـە (جاك)ی گوت: (ئـەو پـیاوە لـە داهێـنەرە ناودارەکانەو، باش وایە خۆتی پێبناسێنیت).

دوای ئـەوە دەوقـەیان لەگـەڵ یـەك کـردو، (جاك) بـە شـەکەتییەوە هاتەوە ژوورەکەی خۆی!

بـەڵام (ئۆفـید) لـە بـیری ئەوەدا مایەوە، هەندێ پارە پەیدا بکات و، خـۆی بگەینێـتە نـێو سەرنشـینانی پلـە یـەکی کەشـتییەکە، پـاش ماوەیەکی کەم، بینی دوو پیاو قسە دەکەن، یەك لەوانە پیرەمێردێکی بەساڵاچـووی خـەڵکی کەنـەدا بـوو، ئـەوەی تـریش لاو بـوو، ئـەویش گوێـی لـە قسـەکانیان ڕاگـرتوو، بیسـتی لاوەکـە لـە پیرە کەنەدییەکەی پرسی:

ـ (ئـەو دەرمانـە چییە، کـە دەڵێـی لـەو تایـە درێژخایەنـە دەربـازت دەکات، کە دووچاری هاتوویت)؟!

ـ (ئەمە دەرمانێکی سەیرە!! بە تەنیا تاو، سەریەشەو، سووتان چاك ناکاتـەوە، بـەڵکو توانایـەکی ئەفسوناویی هەیـە، وای لێهاتووە خەڵکان نـاوی دەنـێن، ئیکسیری نهێنی دەرخەر، ئەمەش چونکە ئەوەی چەند دڵۆپـێکی لەگـەڵ ئـاو، یـان هـەر شـلەیەکی تـر لێـبخوات، توشـی جۆرە بـارێکی شـێتی دەبێـت، هەرچی نهێنیـیەکی هەیەتی ئاشکرای دەکات، دوای ئەوەش هیچی بەبیرنـایێتەوە، کە چی درکاندووە).

لاوەکە بەو دەرمانە زۆر سەرسام بوو و!! پرسی:

ـ (باشە ئەو دەرمانەم لە کوێ دەست دەکەوێت)؟!

- (تۆ ناچیته نیۆرك)؟

- (بەڵێ.. با)!

- (ده ئـهم ناونیشانه لای خـۆت بنووسـه: شـهقامی یانـزه.. دوکـانی ژماره بیست و چوار.. بەڕێز شیشلنۆ.. ئـهو چهند دلۆپـی کـهم لـهو دەرمانـه دەفرۆشـێت و، بـه قورسـایی خـۆی، لـه بەرامـبەردا زێـڕ وەردەگرێت).

(ئۆفید سۆلیڤۆ) ئـهو ناونیشانەی ئەزبـەر کـردو، لـه دڵـی خۆیـدا گوتـی: (سـوێند دەخـۆم، منـیش ئـهو دەرمانـه دەکـڕم، بـۆ ئـەوەی دەرخـواردی بـۆل هـرمانی ساختەچـیی بـدەم و، نهێنیـیەکەی ئاشـکرا بکەم)!

٩- (جیمس مۆرتیمێر و کچەکەی):

(نۆمـــی مۆرتیمـــێر) لەســـەر پـــیانۆ لـــه هۆڵـــی کۆبوونـــەوەکانی کەشتییەکه مۆسیقای لێدەدا، لەوکاتـەدا (جاك) لێی نزیك بوودەو، پێی گوت:

- (خاتونەکەم.. بێگومان تۆ له فەڕەنسا ژیاویت)؟!

- (تۆ چۆن ئەمەت زانی)؟!

- (ئەو مۆسیقا بەسۆزه هی ئۆپێرای پاریسەو، منیش پاریسیم).

- (ئەمه بەڕاست!! بەڕاستی پاریس شارێکی گرنگه)!

- (بـەڵێ خاتوونەکەم.. بەڵام من بڕیارم داوه جێی بهێڵم، بۆ ئەوەی بچـــمه نـــیۆرك، لـــه کارگەکـــەی جـــیمس مۆرتیمـــێر زانیاریـــیه میکانیکییەکەم زیاتر بکەم).

- (تۆ ئەو پیاوە دەناسی)؟!

- (نەخێر.. بەڵام ئەوەندە دەزانم، کە ئەو پیاوە یەك لە هەرە هەڵکەوتووەکانی ئەمریکایە)!

- (باشە دەتەوێت بیناسیت)؟

- (خاتونەکەم.. ئەوە خەونی منە)!

- (کەوابێت بزانە: ئەو پیاوەی باسی دەکەیت باوکی منە)!

(جاك) زۆری لە خۆی کرد، تا وای پیشاندا، بەم ڕێککەوتە سەرسوورِماوە، ئینجا خۆی بە کچە ناساندو، کچەش بردی بە باوکی خۆی ناساند.

ئیتر هەردوو میکانیکی (جاك) و (مۆرتیمێر) کەوتنە سۆراغی ئیش و کارەکانی یەك، (مۆرتیمێر) باسی ئەو ئامێرەی کرد، کە دایهێناوە، (جاك) گوتی:

- (بەڵام ئەو ئامێرەت عەیبێکی هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە دەنگی بەرزە، جا من ڕێگەیەك دەزانم، ئەگەر پێت باش بێت، وا دەکەین، دەنگەکەی کەم بکەینەوە)؟

دوای ئەوە (جاك) بە درێژی باسی لە سیماکانی ئەو ئامێرە نوێیەی کرد، کە لە (جیل لابرۆ)ی دزی بوو و، وای پیشان دا، کە ئەوە داهێنراوی خۆیەتی.. (مۆرتیمێر) بەمە زۆری پێ سەرسام بوو.

(جاك) بۆ ئەوەی لە (مۆرتیمێر) نزیك ببێتەوە، گوتی:

- (گەورەم.. من دڵخۆش دەبم، ئەگەر دەست لە سوودەکانی ئەو ئامێرەدم هەڵبگرم و، بە ناوی تۆ ئەو داهێنراوە تۆمار بکەین)!

(مۆرتیمێر) بە سەرسامییەوە گوتی: (بەڵام ئەو داهێنراوەی تۆ قازانجێکی زۆر وەدەست دێنێت، دواتریش بەڕێز هرمان تۆ...)

(بۆل هرمان) نەیهێشت تەواوی بکات و، گوتی: (گرنگ نییە گەورەم.. من لە قسەی خۆم پەشیمان نابمەوە).

(مۆرتیمێر) کارتێکراو بوو بەو هەموو لوتفەی (بۆل هرمان) و، نەیزانی چ بڵێت، بۆیە ڕازی بوو و، گوتی: (کەوابێت منیش ڕازی دەبم، بەڵام بەو مەرجەی تۆش لە کارگەو کارەکانی من ببیتە هاوپشك و، ببیە بەڕێوەبەری کارەکانم)!

(جاك) کە شتێکی وای لە خوا دەویست، دەست بەجێ ڕازی بوو.. ئیتر کەوتە خەیاڵی ئەو ئاسوودەییەی، کە لەگەڵ ئەم هاوپشکە نوێیەی و کچە جوانەکەی چاوەڕوانی دەکات و، لەو خەیاڵانە ڕۆچوو، تا (ئۆفید سۆلیڤۆ) لێی هاتە پێش و، ئەو خەیاڵە خۆشانەی لێ تێکدا!

بۆ بەیانی ڕۆژی دووەمیش، (جاك) بینی (ئۆفید سۆلیڤۆ) لە پشت پیاوێك وەستاوەو، خەنجەرێکی بە دەستەوەیە!! پیاوەکە جانتایەکی پڕ لە پارەو سامانی گران بەهای پێیەو، (ئۆفید سۆلیڤۆ) پێی زانیوە.. لەو کاتەدا کەشتیەکەیان بە تەك کەشتییەکی تردا تێپەڕی و، بووە هات و هاوار، (ئۆفید سۆلیڤۆ) ئەو هەڵەی بە زێڕین زانی و، بڕیاری دا دزیەکەی ئەنجام بدات، بەڵام هەر ئەوەندە قورپی جانتاکەی بڕی و، (جاك) لێی کردە هەرا، چونکە (جاك)یش لە لایەن خۆیەوە بۆ هەلێکی وەها دەگەڕا، تا خاڵێکی لاوازی (ئۆفید

سۆلیڤۆ)ی دەست بکەوێت، مەبادا ڕۆژێ لە ڕۆژان (نۆفید) بەوە بزانێ، (جاك) کەسێکی ساختەچییەو، کوڕە خاڵۆکەی خۆی نییە، ئیتر زمانی لێبدات و، تووشی بکات، بۆیە (جاك)یش بە دوای کەموکوڕییەکی ئاوەهای (نۆفید)دا دەگەڕا!

(جاك) پێی گوت: (کوڕە بووەستە دزە ناقۆڵاکە، ئاگام لێتە)!

- (تکا دەکەم کوڕە خاڵە ئازیزەکەم ئاشکرام مەکە)!!

لێرەدا (جاك) جانتاکەی لە دەست (نۆفید) دەرهێناو، بۆ خاوەنەکەی گەڕاندەوە، پێشی گوت: (ئەم پیاوە، کە ناوی نۆفید سۆلیڤۆیە، ئەو ئەم جانتایەتی دزی، بەڵام تکایە ئابڕووی مەبە، چونکە لە خانەوادەیەکی خانەدانە)!

پیاوەکە بە چاوێکی پڕ لە ڕقەوە بۆ (نۆفید)ی ڕووانی و، بە (جاك)ی گوت: (ئەم پیاوە کاری لەم شێوە گەندەی زۆرە، پێشتر چەند جاری تریش لە دزی گیراوە، بەڵام لەبەر دڵی تۆو، ئەو خانەوادەیەشی کە دەڵێی خانەدانن، من چاوپۆشی لێدەکەم و، ئابڕووی نابەم).

(جاك) سوپاسی کابرای کردو، بەرەو لای (نۆفید) هات، کە تازە (نۆفید) دەستی کەوتبووە بن سەری ئەو و، پێی گوت: (ها دزە!! دەتەوێت دەوڵەمەند بیت)؟!

- (نا کوڕە خاڵەکەم.. دڵنیابە من تەنها بۆ ئەوە ئەو دزیەم کرد، بۆ ئەوەی لە دەست هەژاری دەرباز ببم)!

- (بەر لە هەر شتێك بە كوڕە خاڵ ناوی من مەبە، چونكە من نامەوێت، كەس بەوە بزانێت، كە لە خانەوادەكەی من دزێك هەیە، بۆیە دەبێ ئاگادار بیت، كەس نەزانێ من و تۆ خزمین)!

- (باشە بەسەرچاو)!

- (گوێ بگرە ئۆفید.. من بوومە هاوپشكی مۆرتیمێر.. هەوڵ دەدەم ببمە زاواشی، ئەوەش دەزانم، كە تۆ چاوچنۆكی و حەزت لە پارەی زۆرە، جا ئەگەر بە قسەی من بكەی، ئەوە خەنیت دەكەم)؟!

- (بەڵێ گەورەم.. بڵێ بمرەو دەمرم)!

- (بەس ئاگادار بە، وەكو پێتم گوت: وای لە حاڵت، ئەگەر باس لەوە بكەیت، كە ئێمە خزمایەتیمان هەیە!! لەوەش دڵنیابە، كە گەشتینە نیوۆرك، دەتكەمە یەك لە سەرپەرشتیكارانی كارگە)!

ئینجا هەندێ پارەی پێداو، جێی هێشت.

بەمجۆرە دوو مانگ دوای گەیشتنی بە (نیوۆرك)، (جاك) بووە جێگری خاوەنی كارگە، (نۆمی) وای لێهات، ئارەزووی بۆ جولاّ، (ئۆفید سۆلیڤۆ)ش كرێكارێكی بچوك بوو، لە لای.. مانگێك دوای ئەوەش (جاك) (نۆمی)ی خواست و، ناسنامەو بەڵگەنامەی پێویستی دەرخست، كە ناوی (بۆل هرمان)ە، ئەمە وای كرد، (ئۆفید سۆلیڤۆ) ئەمجارە لە خۆی بە گومان بكەوێت، كە گومانی دەبرد، ئەوپیاوە كوڕە خاڵەكەی نەبێت، بۆیە چیدیكە گومانی لەوە نەما، كە ئەمە كوڕە خاڵی خۆیەتی.. (جاك)یش چیدیكە باسی لە تاوانەكانی ئەو

نەکرد، ئەوەشی زانی، کە (حەننە) بڕیاری بەندکردنی هەتا هەتایی بەسەردا براوە، بۆیە ئەوپەڕی ناسوودە بوو.

١٠ـ (شلەی ئیکسیر):

(جاك) وای لێهات بە باشی مامەڵەی لەگەڵ (نۆفید سۆلیڤۆ) دەکرد، لە کارەکەی بەرزی کردەوەو، کردی بە سەرپەرشتیاری گشتی کارگە، بەڵام (نۆفید سۆلیڤۆ) ئیرەیی بە (جاك) دەبرد، بۆیە بە لێبڕاوی لە دوای بوو، لە هەڵێکدا ئەو شلەی (ئیکسیر)ەی دەرخوارد بدات، کە کەمێکی لێکرپیبوو.. تا ڕۆژێك هاتە پێش، (جاك) و (نۆفید سۆلیڤۆ) بە مەبەستی ئەنجامدانی هەندێ کاریانەوە لە شارەکانی تری ئەمریکا بە سەفەر دەرچوون، کاتێك لە ژوورەکەی خۆیان لە یەك لە هوتێلەکاندا بە تەنیا گیرسانەوە، (نۆفید) گوتی:

ـ (کوڕە خاڵۆکەم.. ئیتر هیچ بەرگرییەك نەما لەوەی کەوا لەمەودوا خزمایەتی خۆمان ئاشکرا بکەین).

ـ (جا ئەگەر ئەوەمان کرد چ سوودێکمان پێ دەگات؟! لاملێیی لەوە دەکەیت، کە من چاکەم لەگەڵتدا کردو، وەکو برا مامەڵەم لەگەڵدا کردیت)؟!

ـ (من بە هیچ شێوەیەك لاملێیی لەوە ناکەم.. بەڵام تۆ باسی ئەوەم بۆ ناکەیت، کە ئەم هەموو سامانەت چۆن کۆکردەوە، لە کاتێکدا پێنج ساڵ پێش ئێستا کرێکارێکی بچوك بوویت)؟!

ـ (نـازانم تـۆ بۆچـی هێـنده لەسـەر زانیـنی ئـەوە سـووریت؟! پـێم گوتـی، ئامـێرێکم داهێناوەو، داهێنراوەکەم فرۆشتووە، بۆیە بۆم نییە، زیاتر لەو بارەوە بدوێم).

(ئۆفید سۆلیڤۆ) ئـیتر بـێدەنگ بـوو، خزمەتکارەکەشیان قاودیەکی بـۆ هێنان، بێ ئەوەی (جاك) هەست پێبکات، (ئۆفید سۆلیڤۆ) کەمێك شلەی ئیکسیری بـۆ (جـاك) کـردە کوپی قاوەکەی و، دەستیان کرد بە خواردنـەوەی.. لـە پـڕێکدا (جـاك) شـێت ئاسـا دەسـتی بـە کۆکـە کۆك کـرد، ئیـنجا هەسـتی بـە تێنووەتیـیەکی زۆر کـرد، بۆیـە داوای کـرد، هـەندێ عـەرەقی بۆ بێنن، بیخواتەوە.. لێرەوە (ئۆفید سۆلیڤۆ) ڕووی لـە (جـاك) کـردو، پێی گوت: (لە بارەی ئەو داهێنراوەتەوە بۆم بدوێ. کە بەر لە هاتنت بۆ نیوۆرك داتهێنابوو).

(جاك) ماودیەك پێکەنی، ئینجا گوتی:

ـ (تـۆ گـەوجی.. مەبەسـتت کامـە داهێـنراوە؟! مـن جـیل لابـرۆم کوشـت، کارگەکـەیم سـووتاندو، داهێـنراوە نوێـیەکەی ئـەوم دزی. هەرچی تۆیشی، ئـەوا بـەر لـەوەی لـە نـێو ئـەو کەشتییەدا تۆم دیت. پێشـتر لـە هـیچ شـوێنێکدا نەمدیتبوویـت.. ناویشـم بـۆل هـرمان نییە...)

ئـینجا (جاك) ئەوەشـی ئاشـکرا کـرد، کە چۆن ناوی (بۆل هرمان)ی لە خۆی ناوەو، گوتی ناوی ڕاستەقینەی من (جاك جیرۆد)ە.

دوای ئــەوە (جــاك) بــە زەویــدا کــەوت، (ئۆفـید) هەڵـیگرتەودو، خستییەوە سـەر جـێگاکەی، کاتێکـیش بـەیانی (جـاك) هاتـەوە خـۆ،

پرسیاری کرد، شەو چی بەسەر هاتووە؟! (ئۆفید) وەڵامی دایەوە: (توشی بارێکی دەروونی بوو بوویت).

- (ئەدی بۆچ پزیشکێکت بۆ نەهێنام)؟!

- (ترسام گوێی لەو شتانە بێت، کە دەتگوتن، چونکە شتانێکت ئاشکرا کرد، حەزم نەکرد، بێجگەی خۆم کەس بیبیسێت)!

(جاك) ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، لە دڵی خۆیدا دەیپرسی، ئاخۆ ئەبێ کام نهێنیم ئاشکرا کردبێت)؟!

هەرچی (ئۆفید سۆلیڤۆ)شە، نامەیەکی بۆ ئەو نەخۆشخانەیە نووسی، کە (بۆل هرمان)ی تێدا مردووەو، داوای کرد، بەڵگەنامەی مردنی بە ڕەسمی بۆ ڕەوان بکەن و، دوای مانگێك لە نەخۆشخانەکەدا ئەو بەڵگەنامەیەی پێگەیشت، کە مردنی (بۆل هرمان)ی بۆ دەچەسپاند.

(ئۆفید) بەمە دڵخۆشبوو و، لە دڵی خۆیدا گوتی: (جاك جیرۆد.. ئێستاکە کەوتیتە دەستی ئۆفید سۆلیڤۆ)!!

## ١١- (دوای نۆ ساڵ):

نۆ ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوانەدا تێپەڕی، کە باسمان کرد، لە پێنجی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٧٠ ئەو پیاوە ئاینییەش مرد، کە (حەننە) لە کاتی هەڵاتنەکەیدا پەنای بۆ بردبوو، هەروەها ماوەیەکی کەم دوای ئەو، خوشکەکەشی مردو، لە سەرە مەرگیدا، (جۆرج)ی کردە میراتگری خۆی، ئەو وێنەکێشەش، کە کاتێك (حەننە) پەنای بۆ هێنان، لەوێ بوو، خوشکە ئەوی کردە سەرپەرشتیاری (جۆرج) لە

پاشـه خـۆی، چونکه پیاوه ئاینییه‌که‌ی براشی له وه‌سیه‌ته‌که‌ی خۆی، هه‌ر ئه‌وه‌ی داواکردبوو.

پـیاوه ئاینـیـیه‌که بـه‌ر لـه مـردنی نووسـراوێکی دایـه وێنه‌کێشـه‌که، داوای لـێکرد، کاتـێك (جـۆرج) ته‌مه‌نی ده‌بته بیست و پێنـج ساڵ، ئه‌و کاتـه پـێی بـدات، له‌و نووسراوه‌شدا سه‌ربرده‌ی ژیانی (جۆرج) هه‌بوو، کـه چـۆن که‌وتۆتـه لای ئـه‌وان و، چـۆن ئـه‌وان کـردوویانه‌ته کـوڕی خۆیـان.. هـه‌روه‌ها پیاوه ئاینییه‌که به وێنه‌کێشه‌که‌ی گوتبوو، هه‌موو ماڵه‌که‌ی بفرۆشێت، ته‌نـیا کتێـبخانه‌که‌ی وه‌کـو میراتـێك بۆ (جۆرج) بهێڵێته‌وه.

هـه‌ر له‌و ڕۆژژه‌دا، که پیاوه ئاینییه‌که مرد، (نۆمی) ژنی (جاك)یش مـرد، کچـێکی ته‌مـه‌ن هه‌شـت ساڵه‌ی بـۆ (جـاك) لـه دوای خـۆی جێهێشـت، بـه‌ڵام لاواز بـوو، بـه ده‌سـت نه‌خۆشـییه‌کی سـینگییه‌وه ده‌یناڵاند.

(نۆفـید) هیچی لـه‌وه بۆ (جاك) ئاشکرا نه‌کرد، که له باردیه‌وه‌ی له ده‌مـی خۆیـه‌وه‌ی بیستی، (جـاك)یـش بـه‌رده‌وام یارمـه‌تی پوله‌کی به (نۆفـید) ده‌دا، کـه (نۆفـید) هـه‌موو ئـه‌و پاردیـه‌ی له‌سـه‌ر مـێزه‌کانی قومارکردندا ده‌دۆڕاند.

بـه‌ڵام کوڕه‌کـه‌ی (جـیل لابـرۆ) کـه لـه لای پوره‌کـه‌ی گه‌وره‌بـبوو، خـرابووه قوتابخانـه‌و، خـودا وای ڕێکخستبوو، له‌گه‌ڵ (جۆرج)ی کوڕی (حه‌نـنه فۆرتـیه) بکه‌ونه یه‌ك پۆل، به‌ڵام بێ ئه‌وه‌ی هیچ یه‌کێکیان به ڕاستییه‌تی ئه‌وی تر بزانێت!

کوڕەکـەی (جـیل لابـرۆ) ناوی (لوسیان) بوو، سەربوردەی چۆنیەتی کوژرانــی بــاوکی لــە پورەکــەی بیســتبوو، پــوری لەوەشــدا بــڕوای پێهێـنابوو، کە (حەننە فۆرتیە) قەت ناشێت بکوژەکە بێت، بۆیە هەر لـە منداڵیـیەوە هـەموو هـیوایەکی (لوسـیان) ئـەوەبوو، کـە دەگاتــە تەمـەنی لاوێـتی، بـە دوای بکـوژی ڕاسـتەقینەی باوکـیدا بگەڕێـت و، بیدۆزێتەوە.

هەرچی (حەنـنە فۆرتـیە)شـە دووچاری بارێکی نیمچە شێتی هات، بـەڵام زۆری نەبـرد، چاکبوویەوەدو، ئـەوەی بیرکەوتـەوە، کـە ئـەو بـە تاوانی سووتاندنی کارگەو کوشتن و دزی تۆمەتبارکراوە!

بۆیـە کـە گەڕاندیانـەوە بەندیخانە، نامەیەکی بۆ ئەو پیاوە ئاینییە ڕەوانکـرد، کە کوڕەکەی لا جێهێشتبوو، بەڵام لە پیاوێکی ئاینی ترەوە وەڵامـی بـۆ هاتـەوە، کـە پـیاوە ئاینـیـیەکەی پێشوو، کە تۆ مەبەستتە، ئێستاکە مـردووە، هەرچـی خۆشـیەتی - واتـە: پـیاوە ئاینییە تازەکە - هیچ لە بارەی کوڕەکەی نازانێت.

دوای ئـەوە (حەنـنە) نامەیـەکی تری بۆ دایەنی کچەکەی ڕەوانکرد، کەچـی وەڵامـی ئەویشـی بەوشـێوەیە بـۆ هاتـەوە، کـە لەسـەر زەرفـی نامەکـەی نووسرابوو: (ئەو کەسەی نامەکەت بۆ ڕەوانکردووە، نازانین کێیە)!

بـەم شێوەیە (حەنـنە) خـەریك بـوو شـێت دەبـوو، کـە نـەیدەزانی مــنداڵەکانی چــییان بەســەرهاتووە.. حــەوت ســاڵی تــریش لــە بەندیخانـەدا مایـەوە، نـۆ ساڵی پێشـتریش لـەوێ بـوو، واتـە: تەمـەنی

بەندیخانـەی گەیشتبووە زیاتـر لـە شـانزە سـاڵ، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ژنـێکی زۆر بـە ڕەوشـت و ڕێـك و پـێك بـوو، بۆیـە بەرپرسـی بەندیخانەکـە پێشـنیاری ئـەوەی کـرد، لـە بەندیخانـە دەری بکـەن، بـیکەنە بـرین پـێچ لـە نەخۆشخانەو، مووچەیەکی بۆ ببڕنەوە، بەڵام ئەوەندەیە لەژێر چاوەدێریدا بێت و، لێیان ڕانەکات!

(حەنـنە) بـەم پێشـنیارە ڕازی بـوو و، چـووە نەخۆشـخانە، دوای ساڵێك لەبەر لێهاتوویی و دڵسۆزییەکەی بووە سەرۆکی برینپێچان، لە دڵیشـەوە بـیری لـە ڕێگەیـەك دەکـردەوە، بـۆ ئـەوەی ڕابکـات، تـا لـە ڕۆژێکی یەکشەمەدا جلی ژنە ڕاهیبانی لەبەرکرد و، لەو کاتەی بەرەو کەنیسـە دەچـوون، خـۆی خـزاندە نێوانـیان، بـەم شـێوەیە دوای ئـەو هـەموو سـاڵەی بەندیخانـە بـۆ یەکەمجار توانی ڕابکات و، ئازادی خۆی وەدەست بێنێتەوە!

## ١٢- (پۆل هرمان و كچەكەی لە فرەنسا):

با چوار مانگ بۆ دواوە بگەڕێینەوەو، بچینە نیۆرك، (جاك) گەیشتبووە بەهاری پەنجاو سێیەمینی تەمەنی، (ماری) كچیشی لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو، نەخۆشییەكەی هەر لەگەڵدابوو.

(ماری) ڕۆژێكیان لەگەڵ باوكی و (سۆلیڤۆ) دانیشتبوو، كە (جاك) لە پێش خەڵكیدا وای پیشاندەدا خزمیەتی، (ماری) بە باوكیی گوت:

- (باوكە.. پارەو سامانەكەی تۆ دەگاتە چەند)؟!

(جاك) و (سۆلیڤۆ) ئەم پرسیارەیان لەم كاتەدا زۆر بەلاوە سەیر بوو، بۆیە كەمێك بێدەنگ بوو، ئینجا وەڵامی دایەوە:

- (بەڵام كچی خۆم.. ئەم پرسیارە بۆ دەكەیت)؟!

- (هەر لەبەر ئەوەی بزانم چەندت هەیە)!

- (سامانی من تەنها ١٠ ملیۆن دۆلارە، جگە لەمە كارگەكەشم هەیە، كە ئەویش ملیۆنێك دەكات)!

- (تۆ زۆر دەوڵەمەندی باوكە!! بۆیەش دەڵێم: چەند حەز دەكەم كارگەكەت بفرۆشیت و، ئەو پارەو سامانەت بگوازیتەوە فرەنسا)!

- (بەڵام..)؟!

(ماری) نەیهێشت قسەكەی تەواو بكات و، پێی گوت:

- (ئەگەر لێرە بمێنیتەوە باوكە، بێگومان بە نەخۆشیەكەم دەمرم، بەڵام پاریس ئەوەندە دیمەنی ئەفسوناوی و جوانی تیایە، وەكو بیستوومە، نەخۆشیەكەم لەبیر دەباتەوە، وام لێدەكات حەز لە ژیان

بکـەم، بۆیـە دەمەوێـت، حیسـاباتی خـۆت لـێرە یەکلابکەیـتەوە، کارگەکەت بفرۆشیت و، بگەڕێینەوە پاریس)!

ئینجا گریاو، سکاڵای سەختی نەخۆشیەکەی خۆی دەربڕی، بەمە دڵی باوکی نەرم بوو و، پێی گوت:

- (خەم مەخۆ کچم.. دەگەڕێینەوە پاریس).

بەمە کچە باوکەی ماچکردو، لە خۆشییان دەستی کردە گۆرانی گوتن.

بەڵام (ئۆفید) (جاك)ی جیاکردەوەو، پێی گوت:

- (بەڕاست دەتەوێت بگەڕێیتەوە فەرەنسا)؟!

- (بەڵێ.. وادەم پێداو، مەسەلەکە تەواو)!

- (بەڵام من نایێمەوە ئەوێ، چونکە بێگومان پۆلیس دەمگرێت)!

- (دە ئێستا ماوەیەکی زۆر بەسەر تاوانەکەتدا تێپەڕیوەو، هیچت لەسەر نەماوە)!

- (ئەگەر واش بێت، بەڵام تۆ هیچ چارت نییە، هەردەبێت، کارگەکەتم بۆ جێبهێڵیت و، پەنجا هەزار دۆلاریشم پێ بدەیت، بۆ ئەوەی بە هۆیەوەی بەڕێوەی ببەم، ئەمەش لەبەرامبەر ئەوەی، کە من هیچ نهێنییەکت ئاشکرا ناکەم)!

(جاك) هەڵسایەوەو، هاواری بەسەردا کرد:

- (مەبەستت چییە)؟!

- (بۆل هێرمان، یان باشتر بڵێم: جاك جیرۆد.. بەسیە دووڕوویی، یانی لەو بڕوایەی من ئاگام لە تاوانەکانی تۆ نییەو، نازانم بە ساختە

ناوی کوڕە خاڵەکەی منت لەخۆ ناوە؟! هەروەها ژنێکی داماو هەیە، لەسەر ئەو تاوانانە لە بەندیخانەدا دەناڵێنێت، کە تۆ ئەنجامت داوە)!

(جاك) ویستی هێمن بێتەوە، گوتی:

- (ئەگەر ئەوەی دەیلێیت، ڕاستیش بێت، بەڵام بە تێپەڕینی کات، سزا لەسەر مرۆڤ دەکوژێتەوە).

- (ڕاستە.. بەڵام بە ساختە ناوی مرۆڤێکی تر بنێیتە خۆت، بە تێپەڕینی کات، سزاکەی ناکوژێتەوە)!

(جاك) بێتاقەت بوو و، گوتی: (دەتکوژم)!

(ئۆفید) بە ساردییەکەوە گوتی:

- (ئەمەش هەر سوودت نادات، چونکە وەسیەتی خۆم نووسیوەو، لای پارێزەرەکەم داناوە، تیایدا هەموو ئەو تاوانانەی تۆشم بە سەلمێنراوی خستۆتەڕوو)!

(جاك جیرۆد) لێرەدا هیچی بۆ نەمایەوە، ئەوە نەبێت، وازی لە کارگەکەی هێنا، بۆ (ئۆفید)و، (ئۆفید) بووە خاوەنی کارگەکەی.

١٣- (جۆرجی پارێزەر):

(جاك) لە پاریسدا کۆشکێکی کڕی، دەرگاکانی بۆ میوانان و ئاهەنگە جۆراوجۆرەکان خستە سەر پشت، دوای ئەوە بە دوای پارچە زەوییەکدا گەڕا، بۆ ئەوەی بیکڕێت و کارگەی لەسەر دابمەزرێنێت، کاتێك دۆزیەوەو، کڕیی، ڕووبەڕووی هەندێ کێشەی یاسایی بووەوە،

بـۆ چارەسـەری ئـەو کێشـانەی، بـرادەرێکی ڕەوانـەی لای (جـۆرج دارییە)ی کرد، پێی گوت: (ئەو پارێزەرێکی گەنج و لێزانە).

(جـاك) هاتـە لای (جـۆرج)ی پارێـزەر و ، نەیـزانی ئەمـە کـوڕی (حەنـنە فۆرتـیە)یـە، ئـەو ژنـە دامـاوەی مەیـنەتی تاوانـەکانی ئـەو دەچێژێت.

(جاك) لـە نووسینگەی پارێـزەردا، ئـەو ژوورەی تـیای دانیشت ئەو کتێـبخانەیەی تـیابوو، کـە پـیاوە ئاینـیەکە لـە دوای خـۆی جـێی هێشتبوو، (جۆرج)یش ئەسپە دارینـیەکەی خۆی لەسەر دانابوو، بە (جـاك)ی گـوت: (ئەمـە یادگـاری دایکمـە، کـە خوشـکی پـیاوە ئاینـیەکەبوو).. (جـۆرج) ئـەم قسـەیەی بـە ڕاسـتی بـوو، چـونکە نەیدەزانی، کوڕی (حەننە فۆرتیە)یە.

(جۆرج) ڕازی بـوو کێشـەکانی (بـۆل هـرمان) بـە ئەسـتۆ بگرێـت و، دوای مانگێك لـە یەکلاکـردنەوەیان لـە بـەرژەوەندی (بـۆل هرمان)دا، (جۆرج) سەرکەوت.

## ١٤- (لوسی و لوسیان):

(مـاری) کچـی (بـۆل هـرمان) حـەزی لـە پۆشـینی جـل و بـەرگی گرانـبەهاو چـاك بـوو، ئـەو بـەرگدرووەش کـە جلی لە لا دەکرد، ناوی خـاتوو (ئۆگسـتین) بـوو، هـەموو جـارێك (ئۆگسـتین) بـە (لوسـی)دا جلەکانی بۆ دەناردەوە.

(لوسی) بە تەنیا لە ژوورێکدا لە دوورگەی (سانت لویس) ژیانی بەسەر دەبرد، سووریشبوو لەسەر ئەوەی کارەکانی خۆی لە ژوورەکەی خۆیدا ئەنجام بدات، نەك لە کارگەی دروومانەکە، دڵیشی بە گەنجێکەوەبوو، ناوی (لوسیان) بوو، کە کوڕی ئەو (جیل لابرۆ)یە بوو، کە (جاك جیرۆد) کوشتبووی.

(لوسی) هیچی لە بارەی خۆی نەدەزانی، ئەوە نەبێت کچە هەتیوێك بووەو، لە تەمەنی ساڵ و نیویدا دایەنێك خستوویەتیە خانەیەکی بەخێوکردنی منداڵە بێکەسەکان، ئیتر لەوێدا گەورەبووە، تا گەیشتۆتە تەمەنی گەنجی و، هاتۆتە دەر، دەستی کردووە بە کاری بەرگدرووی.

(لوسی) کچی (حەننە فۆرتیە) بوو، بەڵام ئەوەی نەدەزانی!

(لوسیان)یش کاری وێنەکێشی دەکرد، دەرامەتی کەم بوو، بۆیە نەیدەتوانی بێتە خوازبێنی (لوسی)، ناچار داوای یارمەتی لە هاوڕێکانی کرد، بەلکو بۆ ئەو مەبەستە یارمەتیی بدەن، بەڵام ئەوانیش یارمەتییان نەدا، بۆیە (لوسی) پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد، بچێتە لای (جۆرج داریە)، کە یەکێکە لە هاوڕێ دێرینەکانی و، بێگومان ئەو یارمەتیی دەدات.

لەسەر ئەم پێشنیارە (لوسیان) هات بە دوای نووسینگەی پارێزەر (جۆرج دارییە)ی هاوڕێی گەڕا، کە دۆزیەوە، یەکسەر بەرەو لای هات.

لەو کاتە (جۆرج داریە) پێشوازی لە (ئیتیان)ی وێنەکێش و سەرپەرشتیاری دەکرد، (ئیتیان) داوای لێکرد، ئەسپە دارینیەکەی پێ

بدات، بۆ ئەوەی لە کێشانی تابلۆی ئەو دایك و کوڕە کە پۆلیس دایکەکەیان گرت، سوودی لێوەربگرێت، بەڵام هەوالی ئەوەی بە (جۆرج دارییە) نەدا، کە دایکەکە دایکی تۆ بوو.

هەرچی (جۆرج دارییە)یە، ئەو وای گومان دەبرد، ئەو ڕووداوە لە ڕاستیدا ڕووی نەدابێت، بەڵام دروستکراوی خەیالی (ئیتیان) بێت، کەچی (ئیتیان) جەختی بۆ لەسەر ڕاستەقینەیی ڕووداوەکە کردەوەو، هەوالی ئەوەشی پێدا، کە دایکەکە بە دزی و ئاگرکردنەوەو کوشتن تاوانبار کراو، بڕیاری زیندانی هەمیشەیی بەسەردا درا.

کە (لوسیان) گەیشتە نووسینگەکەی (جۆرج دارییە)، باوەشیان بە یەکدا کردو، (جۆرج) (لوسیان)ی بە (ئیتیان)ی سەرپەرشتیاری ناساند، دوای ئەوە بە (لوسیان)ی گوت:

- (لەوانەیە ئێستاکە بووبیتیە سەرۆکی یەك لە کۆمپانیاکان)؟!

- (نەخێر هاوڕێکەم، من تەنها وێنەی ئامێرەکان بۆ کۆمپانیاکان دەکێشم، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەوە بژێویەك دەستخەم، بۆ پێویستیشم، داوای یارمەتیم لە زۆرێکی هاوڕێکانم کرد، وەلامیان نەدامەوە، چونکە بەدبەختم، دەنا ئەگەر وا نەبووام، باوکم نەدەکوژراو، کارگەکەی نەدەسووتێنرا)!

- (بەلام دەبوو بۆ داوای یارمەتی زووتر بهاتبوویتایە لای من، چونکە ئێمە هاوڕێی کۆن و خۆشەویستی یەکین و، ئەرکی سەرشانمە یارمەتیت بدەم، ئومێدیشم وایە، سەرکەوم لەوەی وەکو بەڕێوەبەری کارگەیەکی تایبەت بە هێلەئاسنینەکان داتبمەزرێنم).

- (ئەوە بە ڕاست)؟!

- (بەڵێ.. بۆ ئەو مەبەستەش لەگەڵ بۆل هرماندا هەوڵ دەدەم).

- (بۆل هرمانی داهێنەری گەورە)؟!

- (بەڵێ.. تکاخوازیشم بەخت یارم بێت، لەوەی کەوا بۆ ئەو دامەزرانەی تۆ بتوانم بڕوای پێبکەم).

دوای کەمێك (ئیتیان)ی ڕەسام دەرکی بەوە کرد، کە (لوسیان) کوڕی (جیل لابرۆ)یە، بۆیە هاتە نێو قسەکانیان و، لە (لوسیان)ی پرسی: (باشە بکوژی باوکت چی بەسەر هات)؟

- (وا بزانم بڕیاری زیندانی کردنی بە درێژایی تەمەنی بەسەردا سەپێنراوە، بەڵام من لەو بڕوایەم، ئەو تاوانباری ڕاستەقینە نییەو، بێ تاوانە)!

- (بەڵام تاوانەکە لەسەر ئەو چەسپا)؟

- (ئەمە قسەی دادوەرەکانە، بەڵام من و پورەکەم لەو بڕوایەین، کە جاك جیرۆدی جێگری باوکم لە کارگەکەی، ئەو بکوژی ڕاستەقینەیە).

- (بەڵام ئەو بووە شەهیدی ئازایی و دڵسۆزییەکەی).

- (ئەوە زۆر بڕواپێکراو نییە، بۆیە من هەموو هەوڵی ئێستام بۆ ئەوەیە، جاك جیرۆد بدۆزمەوەو، دەریبخەم کە نەمردووە، ئەوساش تۆڵەی لێ بکەمەوە).

(لوسیان) ماوەیەك لای (جۆرج دارییە) مایەوە، دواتر پاش ئەوەی باسیان لە چەند بابەتێکی وەکو خۆشەویستیەکەی و، شتانی تری

پەیوەست بە ئەو کردو، هەواڵی ئەوەی بە (جۆرج دارییە) دا، کە ئەو حەزی لە کچێکە ناوی (لوسی)یە.. دوای ئەوە (جۆرج دارییە) یارمەتی خۆی پێشکەشی (لوسیان) کرد، بۆیە ئەویش سوپاسی ئەو بەتەنگەوە هاتنەی کردو، هاتە دەر.. بەڵام (ئیتیان)ی ڕەسام لە دڵی خۆی بیری دەکردەوە: (ئایا دەشێ کوڕی کوژراو، برادەرو هاوڕێی کوڕی بکوژ بێت)؟!

هەرچی (لوسی)شە، ئەو کاتەی بیستی (جۆرج دارییە) هەوڵ بۆ (لوسیان)ی ئومێدو ئازیزی دەدات، لای (بۆل هرمان) وەکو بەڕێوەبەری کارگە دایبمەزرێنێت، لە خۆشییان خەریک بوو باڵی دەگرت.

۱۵- (ژنە نانفرۆشەکە):

کاتێك (حەننە) لە نەخۆشخانە ڕایکرد، جلەکانی گۆڕین و، چووە گوندی (شفری).. لەوە نەدەترسا لەوێدا یەکێك هەبێت، بیناسێتەوە، چونکە بە درێژی ئەو بیست ساڵەی زیندانی پڕ لە ئازارو چەرمەسەرییدا، شێوەی بە تەواوی گۆڕابوو.. لەوێدا چووە ماڵی پیاوە ئاینیە نوێیەکەی گوند، وای پیشاندا، کە ژنێك ڕایسپاردووە، سۆراغی پیاوە ئاینیە پێشوەکەی‌و، ئەو کوڕە بکات، کە دوای ئەوەی دایکی گیرا، لە لای ئەوی جێهێڵابوو، بەڵام پیاوە ئاینیەکە گوتی:

- (من ئەو کوڕە ناناسم).

(حەنــنە) پرســیاری نــاوی وێنەکێشــەکەی لــێکرد، گوتــی: (نــاوی ئــەویش نــازانم)! بــەڵام ئــەوەندەی بــە (حەنــنە) گــوت، کــە: (پــیاوە ئاینــیەکەو خوشکەکەشــی مــردون و، یــەك لە کوڕە خوشکەکانی پیاوە ئاینیەکە ئامادەی بە خاکسپاردنی خاڵۆی بوو، لە گوندەکەیان).

(حەنــنە) کــە ئــەو قسانەی لــەم پــیاوە ئاینــیە نوێــیە بیست، شڵەژا، چــونکە ئــەوە مانــای وابــوو، تازە ڕێگەیەك نەما بە هۆیەوەی سۆراغی کوڕەکــەی دەســت بکەوێــت، بــەڵام نیمچــە دڵنــیایی بــۆ دروســتبوو، کــە خوشکی پیاوە ئاینیەکە پەروەردەی (جۆرج)ی کوڕی کردبێ.

بــۆ ڕۆژی دووەم، (حەنــنە) بــڕیاری دا بــە دوای ســۆراغی (لوســی)ی کچیدا بــڕوات، بۆیــە ئــەمجارە هاتــە گونــدی (جوانــی)، بــەڵام سەرسام بــوو!! کــە بیــنی دایەنگاکــە ڕووخێــنراوە!! ئیــنجاش کــە پرســیاری دایەنەکەی لــە یەك لە هاوسێکانی دایەنگاکە کرد، ژنە هەواڵی ئەوەی پێدا، کە دایەنەکە مردووە.. دوای ئەوە (حەننە) پرسی:

- (بــەڵام ئایــا چارەنووســی ئــەو کچــە بچــوکە نــازانی، کــە دایکــی لەو دایەنگایــەی دانــابوو، بــەڵام دواتــر نەیــتوانی مانگانە هەقی دایەنگاکە بدات، بۆیە نەهاتەوە بە شوێنی و، وازی لێهێنا)؟

- (ئەوە لە سەردەمێکی زووەوە بووە)؟

- (بەڵێ.. بەر لە بیست و دوو ساڵ بەر لە ئێستا بووە).

(ئــەو کاتــە مــن لــێرە نەبوومــە.. بــەڵام بــۆت هەیــە، بچــیتە بــنکەی پۆلــیس، لــەوێدا پرسیاری ئەو کچانە بکەیت، کە لەو ساڵی ئاماژەی بۆ دەکەیت، خراونەتە ئەو دایەنگایە).

(حەنـنە) سوپاسـی کـردو، لـێی جـیابووەوە، بـەڵام نەیوێـرا بچێتە بـنکەی پۆلـیس و، ئـەو پرسـیارەی بکـات، بۆیـە هاتـە لای خـەڵکی گوندەکەو، لە زۆربەیانی پرسی، بەڵام هیچێکی سوودمەندی لە بارەی هـەواڵی کچـەکەیەوەی لـە کەسـیان نەبیست، بۆیـە بـۆ بـەیانی ڕۆژی دووەم بـە هەناسـە ساردی گەڕایـەوە پـاریس و، ئـیتر بە دوای کارێکدا گەڕا، بژێویەکی لێ دەست بکەوێت.

دوای دوو ڕۆژ لــە یــەك لــە نانەواخانــەکاندا کــارێکی دۆزیــەوە، کارەکـەی ئـەوەبوو، نـان بگەینێـتە ماڵەنانکرەکانی نانەواخانەکـە، لـە بەرامـبەر ئـەوەش ڕۆژانەکـەی لـە هـەر ڕۆژێکـدا سـێ فـرەنك و نـیوە، لەگـەڵ دوو نـان، لـەو نانەواخانەشـدا (حەنـنە) گوتـی نـاوم: (لـیزا بیرین)ە، ئەمەش بۆ ئەوەی نەناسرێتەوە.

قـەدەر وایکـرد، (لوسی) کچی یەك لە نانکرەکانی ئەو نانەواخانەیە بێـت، بــەڵام هــیچ یەکــە لــەو دایــك و کچــە نــەیاندەتوانی یــەکتر بناسـنەوە، هەرئـەوەندەبوو، (لوسـی) سـێبووری زۆری بــە (حەنــنە) دەهـات و، قسەی خۆشـی لەگـەڵدا دەکرد، (حەننە)ش دڵی بە (لوسی) خۆشـدەبوو، زۆرجار لە تەکیدا دادەنیشت و، سەیری دەکرد، کە جل و بەرگی دەدرووی.

١٦ـ (هەوڵەکانی جۆرج دارییە):

(جۆرج دارییە) ڕاستگۆ بوو، لەو وادەیەی بە (لوسیان)ی دابوو، بۆیە بۆ ڕۆژی دوواتری سەردانەکەی (لوسیان) بۆ ئەو، چووە ماڵی (بۆل هرمان)، بەلام (بۆل) بە سەفەر چوو بوو، بۆیە بە تەنیا چاوی بە کچەکەی کەوت، ئەو کچەی، کە لە بارەی زیرەکی (جۆرج)ەوە، باوکی زۆری بۆ باسکردبوو.

(جۆرج) هەواڵی (لوسیان)ی هاوڕێی بە کچە گەیاندو، باسی لە لێهاتوویی و چالاکی و تواناکانی ئەو کوڕەی بۆ کرد.. (ماری) گوتی:

ـ (ئەو پەڕی خۆشحاڵ دەبم، ئەگەر بتوانم هاوکاریت بکەم، لە یارمەتیدانی ئەو هاوڕێیەت، هەروەها زامنی ئەوەشی بۆ دەکەم، کە لە وەرگرتنی پایەیەکی کارگێڕیدا سەرکەوتن بە دەست بێنێت).

(جۆرج) سوپاسی زۆری کرد و، یەکسەر بەرەو نووسینگەکەی خۆی ڕۆیشت. نامەیەکی بۆ (لوسیان) نووسی و، لە مەسەلەکەدا دڵنیای کرد، کاتێکیش ئەم نامەیە گەیشتە (لوسیان)، ئەویش بە پەلە هاتە لای (لوسی)و، ناواخنەکەی بۆ باسکرد، (لوسی) بەمە یەکجار خۆشحاڵبوو!! بەلام لەوانە نەبوو، کە زۆر بە دوای بنج و بناوانی شتەکاندا بچێت، بۆیە لە بارەی ناوی کارگەکە، هیچ پرسیارێکی لە (لوسیان) نەکرد.

بۆ ڕۆژی دووەم (لوسی) چووە ماڵی (ماری)، بۆ ئەوەی کراسە نوێکەی بۆ بگرێت.. دوای لێبوونەوەی، (ماری) داوای لێکرد، لە لای دابنیشێت و، لێی پرسی:

- (ئایا لەگەڵماڵەوەت دەژیت؟ یانیش تەنیایت و، هەر لە نێو کارگەدا دەژیت)؟

- (نەخێر خاتوونەکەم.. من بە تەنیا دەژیم.. چونکە من کەسم نییەو، هەر لەوەتەی تەمەنم ساڵ و نیوێك بووە، لە یەك لە خانەکاندا گەورەکراوم)!

- (بەڵام باشە نازانیت، کێ تۆی خستە ئەو خانەیە)؟!

- (بەڕێوەبەری خانەکە پێی گوتم، ئەوانەی تۆیان هێنایە ئێرە، چیرۆکی تۆیان تێگەیاندووم، بەڵام بە پێی یاسای خانەکان، ناکرێت، ئەو ڕاستییانە بۆ تۆ باس بکەم، ئەوانیش ئەو نهێنییانە لای خۆیان دەهێڵنەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر دوای چەند ساڵیش بێت، پرسیاری هەر منداڵێکی لەو بابەتەیان لێبکرێت، بە ئاسانی کەس و کارە ڕاستەقینەکەی بدۆزنەوە).

(ماری) بەزەیی بەو کچە داماوەدا هاتەوەو، هەوڵی دا ڕووی قسەکان بگۆڕێت، گوتی:

- (لوسی.. تۆ جوانیت!! بەرگدرووێکی دەست ڕەنگینیشی!! لەوبڕوایەشدام، ڕۆژێ دێ، کوڕە لاوێکی وەها دێتە داخوازیت، هەموو ئەو تاڵییانەی ژیانت بیر دەباتەوە).

کوڵمەکانی (لوسی) سووربوونەوەو، گوتی:

- (لەوانەیە ئەو کوڕەم دەستکەوتبێت!! بەڵێ!! کوڕێکی قۆز خۆشمی دەوێت و، چاوەڕوانی ئەوەیە تۆزێك باری ئابوریی باش بێت، تا بمهێنێت)!

لە پڕ کۆکەیەکی توند (ماری)ی گرت، دەستەسڕەکەی خستە سەر دەمی و، کە تەماشای کرد، بە خوێن بووە.. هەرچی (لوسی)شە، داوای یارمەتی کرد لە (ماری) بۆ ئەوەی ڕێگەی بدات و، بڕوات، (ماری)ش ڕێگەی داو، تا پێش دەرگا لەگەڵی چوو، لەوێدا پێی گوت:

- (دەمەوێت بێمە سەردانی ماڵەکەت، ڕێگەم دەدەیت)؟

(لوسی) ڕەزامەندیی بۆ نواندو، بەم شێوەیە ناونیشانەکەی پێدا:

(شەقامی بۆربۆن.. ژمارە: ٩)و، ئیتر خواحافیزیی کرد.

بۆ ڕۆژی دووەم (جاك جیرۆد) گەڕایەوەو، (جۆرج داریە) دانیشتنێکی بۆ ئەوو (لوسیان) بەیەکەوە ڕێکخست.

لە ڕۆژی دیدارەکە، (لوسیان) خۆی پۆشتەکردو، کە خواحافیزیی لە (لوسی) کرد، پێی گوت:

- (دەچمە لای بۆل هرمان، بەڵکو لە کارێکدا دام بمەزرێنێت).

(لوسی)ش پێی گوت:

- (منیش ئاشنایەتیم لەگەڵ ماریی کچیدا پەیداکردووە).

(لوسیان) بەرەو دیداردکەی هاتە ماڵی (بۆل هرمان) و، کچەکەی پێشوازیی کرد، کە کچە چاوی پێی کەوت، قۆزێتی (لوسیان) سەرنجی ڕاکێشاو، موژدەی ئەوەی پێدا، کە خەمی نەبێت، باوکی دایدەمەزرێنێت، دوای ئەوە باوکیشی هاتە لایان، کچە (لوسیان)ی بە باوکی ناساند.. (جاك) گوتی:

- (تۆ داوات کردووە بتکەمە بەڕێوەبەری کارگە نوێیەکەم.. وانییە)؟

- (بەڵێ گەورەم).

- (باشە لە چ ڕوویەکەوە تواناداریت)؟

- (مـن دەسـتێکی ڕەنگیـنم هەیـە، لـە کێشـانی وێـنەی ئامـێرەجۆراوجۆرەکان و، هـەروەها لـە بـواری فیـتەری هـێڵەکانی شەمەندەفەریشدا شارەزایی باشم هەیە).

- (ناوت چییە)؟

- (لوسیان لابرۆ.. خەڵکی فۆرتفیلم).

ئەم وشانە بروسکە ئاسا لە (جاك)یان دا، لێرەدا کچەکەی گوتی:

- (جۆرجی پارێزەر بۆی باسکردووم، کە لاوێکی چالاکەو، کارئاسانی بـۆ بکـەین، هـەروەها ئەوەشـی پـێ گـوتم، کـە کوڕێکـە بۆتـە قوربـانی کارەسـاتێك، چـونکە کـە ئـەو بچوك بووە، باوکی کوژراوەو، کارگەکەی سووتێنراوە)!

(جاك) کەمێك هاتەوە خۆی و، گوتی:

- (ڕاسـتە.. بیرم کەوتەوە.. بکوژەکە ژنێك بوو، ناوی حەننە فۆرتیە بوو).

- (ئەمـە دادوەرەکـان وایـان لە قەڵەم دا، بەڵام من وای بۆ دەچم، کە ئەو ژنە بێ تاوانە).

- (ئەدی تاوانبار کێیە)؟!

- (پـورم پـێی ڕاگـەیاندم، ئـەو گومـانی لـە جـاك جیرۆدی جـێگری بـاوکم بـووە لـە کارگـە، ئـەو نامەیـەکی بـۆ حەنـنە نـاردووەو، تـیایدا بەڵگەی ئەوە هەیە، کە ئەو بکوژی باوکمە).

(جاك) دیسانەوە شڵەژا، بە پەلە پرسی:

- (ئەدی ئەو نامەیە چی بەسەر هات)؟!

- (گەوردم.. ئەو نامەیە بەداخەوە ون بوو)!

ئاسوودەیی گەڕایەوە دڵی (جاك) و گوتی:

- (بێگومان ئـەو مەسـەلەیە جێی داخـە، بـەلام تـۆ پـێم بڵـێ: هـیچ سوودێك دەبینی؟ لە دۆزینەوەی بکوژی ڕاستەقینە)؟!

- (بــەڵێ.. دەشــێ جــاك جـیرۆد لــە دادگــا دەربــازی بێــت، بــەلام ریسووابوونی دەبێـتە باشـترین تۆڵە لێی، چونکە بێگومان: ئەو ئێستا دەوڵەمـەندەو، خانەوادەیـەکی باشـی بـۆ خـۆی پێکهێـناوە، ئەوەش بە خێری ئەو داهێنان و پارەیەی کە لە باوکمی دزی)!

وایلـێهات (جـاك) لـە دڵـی خۆیدا بیر لەو لاوە بکاتەوە، ئایا پێویستە خـۆی لـێ ڕزگار بکات؟! یان چی؟! بەلام دواتر گەیشتە ئەو ڕایەی، کە دانــایی ئەوەیــە ئــەو لاوە بخاتــە ژێــر کۆنـترۆڵـی خـۆی و، چـاوەدێری سـەرجەم کـارو کردەوەکانی بکات، بۆیە ڕازی بوو لەسەر ئەوەی، وەکو بەڕێوەبـەری کارگـە نوێـیەکەی دایبەمەزرێنێـت و، بـە مووچـەیەکی هەزار فرەنکی لە هەر مانگێکدا.

کـە (مـاری) بـەم ڕەزابوونەی باوکیی زانی، نەیتوانی ئەو فرمێسکی خۆشیەی بشارێتەوە، کـە کەوتە سەر کوڵمی و، بەرەو (لوسیان) هات، داوای لـێکرد بـۆ بـەیانی دەعوەتـی نانخواردنیان بێت، لە ماڵەکەیاندا، (لوسیان)یش دوای زۆر داواکردنی (ماری)، ڕازی بوو.

دوای ڕۆیشتنی (لوسیان)یش، (ماری) دڵخۆشی خۆی بۆ باوکی ئاشکرا کرد، کە ڕازی بوو لەسەر ئەوەی (لوسیان) وەك بەڕێوەبەری کارگە نوێیەکەی دابمەزرێنێت.. بەڵام (جاك جیرۆد) کە زانی کچەکەی دڵی بەرەو (لوسیان) ڕۆشتووە، بیرۆکەی سەیری بە بیردا هات.

## ١٧ـ (حەننە دەبتە هاوسێی لوسی):

ئەو کاتەی (لوسیان) لای (پۆل هرمان) بوو، (لوسی) لە ژوورەکەی خۆی بوو، لەگەڵ (حەننە فۆرتیە).. (حەننە) بە سۆزێکی زۆرەوە دەیڕوانییە (لوسی)! بێ ئەوەی بزانێ هۆی ئەم سۆزەی بۆ ئەو کچە چییە؟! لە ڕاستیدا (لوسی)ش بە شێوەیەکی زۆر باش مامەڵەی لەگەڵ (حەننە) دەکرد.. زۆرجار کە جل و بەرگەکانی بۆ دەدووری، هیچ پارەیەکی لە بەرامبەردا لێ وەرنەدەگرت.

(حەننە) ئەوەی کەوتە سەر، شتێك لە بارەی (لوسی)یەوە بزانێت؟ بۆیە لێی پرسی:

- (لوسی.. تۆ لە کوێ فێری بەرگدرووی بوویت)؟

- (لەو خانەی کە تیایدا دەژیام).

(حەننە) خورپەیەکی بە دڵدا هات و، گوتی:

- (بۆ؟! تۆ لە خانە گەورە بوویت)؟!

- (بەڵێ.. من دایك و باوكی خۆم ناناسم.. بەر لە بیست و یەك ساڵ من خراومەتە خانەیەك تیای گەورەبم، كە ئەوسا تەمەنم تەنیا ساڵ و نیوێك بووە)!

(حەننە) لێرەدا ئەو پرسیارەی لە بیردا درووستبوو: (ئایا دەشێت لوسی كچەكەی من بێت)؟!

ئینجا لێی پرسییەوە: (ئەی كێ ناوی نای لوسی)؟

- (دەڵێن من لە ڕۆژی یادی ژنە خواناس لوسی خراومەتە خانە، بۆیە بەم بۆنەیەوە ناوم نراوە لوسی)!

(حەننە) لێرەدا لە دڵی خۆیدا گوتی: (كەوابێت ئەوە كچەكەی من نییە!! دواتر سەدان كچ هەنە، ناویان لوسییە)!

لێرەدا (لوسیان) هاتە ژوورو، هەواڵی كارە نوێیەكەی بە (لوسی) دا، لوسی بەمە گەلێك دڵخۆشبوو، دوای ئەوە ڕووی لە (حەننە) كردو، پێی گوت: (ئەگەرچی ناوەكەیشیم پێت نەگوتبێت، بەڵام بێگومان تۆ ئەم لاوە دەناسیت؟! ئەمە ناوی لوسیان لابرۆیە).

(حەننە) مووچڕكێكی بە گیاندا هات و، لە كوڕە لاوەكەی پرسی:

- (ئەدی ناوی باوكت چییە)؟

- (باوكم ناوی جیل لابرۆیە.. بیست و یەك ساڵ پێش ئێستا لەنێو كارگەكەی خۆی كوژراوە، بە هۆی ئاگرێك كە بەربووەتە كارگەكەی).

(حەننە) هەوڵی دا خۆی لەوە بپارێزێت، كە گومانی پێ ببەن و، گوتی:

- (وا بزانم ژنێك بە كوشتنەكەی تاوانبار كراوە)؟!

ـ (بەڵێ.. بەڵام دڵم دەڵێ ئەو ژنە بێ تاوانە.. بەڵکو بکوژ ئەو پیاوەیە، کە جێگری باوکم بووە، لە کارگەکەی).

ـ (بەڵام دەڵێن ئەو پیاوە مردووە)!

ـ (من بڕوام بەو قسەیە نییە.. چونکە دەشێت، ئەوە فێڵێك بووبێت، بە هۆیەوەی هەڵاتنی ئاسان بووبێت)!

ـ (تۆ بڵێی ژنە تاوانبارەکەش مردبێت)؟!

ـ (نازانم.. بەڵام من بە هاوکاری هاوڕێیەکی پارێزەرم، بە پەرۆشی بە دوای دا دەگەڕێین، بۆ ئەوەی بیدۆزینەوە).

(حەننە) خەریك بوو خۆی ئاشکرا بکات، بەڵام کە بیری کردەوە، وای بە باش زانی جارێ بۆ ماوەیەك خۆی بێدەنگ بکات، ئینجا گوتی:

ـ (ئەو ژنە تاوانبارە کوڕو کچێکی هەبوو.. دەبێ چییان بەسەردا هاتبێت)؟!

ـ (نازانم خاتونەکەم)!

(حەننە) لە ترسی ئەوەی ئاشکرا بێت، خۆی بێدەنگ کردو، چیتری نەگوت، ئینجا (لوسیان) هەواڵی بە (لوسی) دا، کە ئەو خانووەکەی نزیك ماڵی ئەو جێدەهێڵێ و، دەچێت لە خانووێکی نزیك ماڵی (بۆل هرمان) دادەنیشێت، (لوسی)ش بە ناچاری ڕازی بوو.. لێرەدا (حەننە)ش داوای لە (لوسیان) کرد، کە خانووەکەی بە ئەو بدات، بێتە ناوی.. (لوسیان)یش بە خۆشحاڵییەوە ڕازی بوو،

چونکە لەو کاتەی خۆی لە (لوسی) دوور دەبێت، (حەننە) لە نزیکی دەبێت.

## ١٨ـ (خۆشەویستییەکی یەك سەرە):

(ماری) پاساوی جۆراوجۆری دروست دەکرد، بۆ ئەوەی لە (لوسیان) نزیك بێتەوە، داواشی لێدەکرد، هەموو ڕۆژانی یەکشەمەیەك بێت لە ماڵی ئەوانی بەسەر ببات.. (لوسیان)یش هەستی بەو هەموو گرنگییە دەکرد، کە ئەو کچە بەوی دەدا.. دەیزانی تا چ ڕادەیەك خۆشی دەوێت.. بۆیە زۆر بەزەیی بەو کچە نەخۆشە هاتەوە، چونکە دەیزانی ئەو خۆشەویستییەی بە (لوسی)ی دەبەستێتەوە، لە سەرووی هەموو خۆشەویستییەکەو، لە بێجگەی (لوسی) ناتوانێت، دڵ بە هیچ کچێکی تر بدات.

لە یەك لە ڕۆژە یەکشەمەکان، (جۆرج دارییە) (لوسیان)ی هاوڕێی بۆ ماڵەکەی خۆی دەعوەت کرد، (لوسیان)یش دەعوەتەکەی قەبولکردو، سوپاسی (جۆرج)ی کرد، کە سەرکەوتووانە یارمەتی دەدات.

دوای نانخواردن، (جۆرج) ئەنجامی کۆششەکانی خۆی لە بارەی دۆزینەوەی (حەننە)ی بە (لوسیان) ڕاگەیاندو، پێی گوت:

ـ (وەکو گەیوومەتە ئەنجام.. ماوەی بیست ساڵ لە یەك لە بەندیخانەکانی نەخۆشی ئەقڵی ماوەتەوە، دواتر گوازراوەتەوە یەك

لە نەخۆشخانەکان بۆ ئەوەی وەك برینپێچ کاری تیا بکات، بەڵام لە ڕۆژێکدا بەرگی ژنێکی خواناسی لەبەرکردووەو، ڕای کردووە).

- (نەشیان دۆزیوەتەوە)؟!

- (نەخێر.. بەڵام وەسفەکانی بەسەر سەرجەم بنکەکانی پۆلیسدا بڵاوکراوەتەوە).

- (ئەو ژنە زۆر داماوە!! ژنە نانفرۆشەکە بۆی باسکردم، کە کاتی خۆی ئەو حەننەیە کوڕو کچێکیشی هەبووە)!

- (بە هەر حاڵ؟! ئایا ئێستاش هەر سووری لەسەر ئەوەی کارگەکەی باوکت، لەسەر هەمان پارچە زەوییەکەی ئەوسای بینابکەیتەوە)؟!

- (بێگومان.. هەر کاتێکیش بە مووچەکەم، بڕە پارەیەکی باشم پاشەکەوت کرد، ئەوا دەست بەجێ ئەو کارە جێبەجێ دەکەم).

لای ئێوارە (لوسیان) هاتە سەردانی (لوسی)ی خۆشەویستی و، (حەننە)ی لە لابوو، کە دوای ئەوەی هۆگری یەکتر ببوون، ئیتر لێی جیا نەدەبووەوە.. (لوسیان) بە (حەننە)ی گوت:

- (وەکو زانیومە، ئەو ژنەی بە کوشتنی باوکم تاوانبار کراوە. لە زیندان ڕای کردووە)!

(حەننە) ڕاچڵەکی و، گوتی:

- (کەوابێت، ئێستا ئازادە)؟!

- (بەڵام ناتوانێت بۆ ماوەیەکی دوور خۆی بشارێتەوە، چونکە وەسفەکانی بەسەر هەموو بنکە پۆلیسیەکاندا بڵاوکراوەتەوە).

لێرەدا (حەننە) دەرکی بەوە کرد، کە دەبێت لەمەولا زیاتر ئاگاداری خۆی بێت.

ئەگەر بۆ ماڵی (بۆل هرمان)یش بگەڕێینەوە، دەبینین (ماری) و باوکی پێکەوە دانیشتوون و، بڕیاری داوە، سەرنجی باوکی بۆ ئەوە رابکێشێت، کە ئەو (لوسیان)ی خۆشدەوێت، هەرچەندە داماوەی هەست بەوەش دەکات، کە (لوسیان) لێی ڕادەکات، بەڵام پاساوی بۆ دێنێتەوەو، بەوە دڵی خۆی خۆش دەکات، کە دەشێت، شەرم بکات پێی بڵێت: خۆشتم دەوێت، بۆیە وادەکات! چونکە لە نێوان هەردووکماندا جیاوازییەکی زۆر لە ڕووەکانی چینایەتی و کۆمەڵایەتی هەیە!

(ماری) بە باوکی گوت:

- (ئێستاکە تەمەنم گەیشتۆتە نۆزدە ساڵ.. دڵخۆشم بەو هەموو خۆشەویستییەی تۆ بۆ من، بەڵام لەولاوەش لە دەروونی خۆمدا پێویستیم بە جۆرێکی تری خۆشەویستی هەیە.. باشە باوکە بە دڵتدا نەهاتووە بمدەیتە شوو)؟!

- (چۆن نا؟! بەڵکو زۆریشم مەبەستە.. بۆیە لە ماڵەکەی خۆمدا بەشێکی گەورەم بۆت داناوەو، بە دوای ئەو کوڕە ئاغا ڕێك و پێکە دەگەڕێم، هاوشانی خۆمان بێت و، بێتە داوات، تا پێیت بدەم)!

- (بەڵام بۆ دەبێت هاوشانی خۆمان و ئاغا بێت؟! من ئەوەم بەلاوە گرنگە، کە خۆشمی دەوێت، با ئیتر لە چینی ئاغاو گەورەپیاوانیش نەبێت)!

(بۆل هرمان) له مەبەستی کچەکەی گەیشت، بۆیە ویستی ئاراستەی قسەکانیان بگۆڕێت و، گوتی:

- (لە مێژەوەیە سەری پاریزەر جۆرج داریبەم نەداوە.. دەتەوێت لەو سەردانەمدا بۆ لای هاوڕێیەتیم بکەیت)؟

(ماری) وای گومان برد، کە باوکی بۆ ئەوە دەچێتە لای (جۆرج داریبە) مەسەلەی ئەوو (لوسیان)ی لەگەڵدا باس بکات، بۆیە ڕەزامەندی بۆ ئەم پێشنیارەی باوکی نواند.

دوای کەمێك (ماری) و باوکی گەیشتنە لای (جۆرج داریبە)، لەو کاتەدا (ئیتیان)ی وێنەکێشیش لای (جۆرج) بوو، ئیتر دانیشتن و، دەستیان بە قسان کرد، تا قسە هاتە سەر (لوسیان) و، (جۆرج) گوتی:

- (داماوە لوسیان، بۆتە قوربانی بە ناهەق کوژرانی باوکی)!

(ماری) کە ئەمەی بیست، مووچڕکێکی بە گیاندا هات و، گوتی: (لە بارەی چییەوە قسەدەکەن)؟!

باوکی وەڵامی دایەوە: (ئەی کچی خۆم پێتم نەگوت: باوکی لوسیان لە کارەساتی سووتانی کارگەکەی تێچوو و، لوسیان بە یەتیمی گەورەبوو)!

- (بەڵام، باشە باوکە کێ بەوە تاوانبارە)؟!

(بۆل) هەوڵی دا، ئاسایی بمێنێت و، تێکنەچێت، بۆیە بە ئاسایی گوتی: (ژنێك، کە ئەوسا پاسەوانی کارگەکەی بوو)!

(جۆرج) هاتە نێو قسەکانیان و، گوتی: (بەڵام لەوانەیە ئەو ژنە زۆرلێکراو بێت، هەروەکو لوسیانیش لەسەر ئەو ڕایەیە، کە هەرزوو

پوری بۆی باسکردووە، ئێستاش وەکو زانیومە: ئەو ژنە لە بەندیخانە هەڵاتووەو، ئازادە، بۆیە بێگومان بە دوای بکوژی ڕاستەقینەدا دەگەڕێت)!

لێرەدا ڕەنگی (بۆل هرمان) زەرد هەڵگەڕا، چونکە لەوە ترسا، ئەم هەڵاتن و ئازادبوونەی (حەنـنە) ببێتە هۆی ئاشکرابوون و ڕیسوابوونی ئەو، پاش ئەوە گوتی: (جا با وای دابنێین، کە لوسیان بکوژی ڕاستەقینەی باوکیشی دۆزیەوە، باشە لەوە چ سوودێك دەبینێت؟! چۆن تۆڵەی خۆی لێ وەردەگرێتەوە، لە کاتێکدا ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو تاوانەیدا تێپەڕیوە)؟!

(جۆرج) گوتی:

- (بێگومان بکوژی ڕاستەقینە، ئێستا بە هۆی داهێنراوەکەی باوکی لوسیان سەروەتێکی زۆری کۆکردۆتەوە، دیارە ناوێکی خوازراویشی لە خۆی ناوە، تا نەناسرێتەوە، لەو بارەشدا تۆڵە وەرگرتنەوەکە بەسۆتر دەبێت بۆ تاوانبارەکە، چونکە لای خەڵك ئاشکراو ڕیسوا دەبێت و، بەمەش لەوانەیە هەرخۆی خۆی بکوژێ و، نەتوانێ بەرگەی ئەوە بگرێت، کە بەسەری دێت)!

(ماری) گوتی: (پڕ بە دڵ دەخوازم لوسیان لەم هەوڵەیدا بۆ دۆزینەوەی بکوژی ڕاستەقینەی باوکی سەربکەوێت و، تۆڵەی خۆی لێ بسێنێتەوە)!

دوای ئەوە ڕووی پرسیاری کردە باوکی و، پێی گوت: (باوکە!! تۆ بۆت باسکردم، کە لە فەرەنسا کارەکانت ڕەواجێکی زۆریان پەیدا

کردوەو، لوسیانیشت کردۆتە بەڕێوەبەری کارگە تازەکەت، ئەدی باشە بۆ نایکەیتە هاوبەشی خۆشت)؟!

باوکی ویستی ئەمە ڕەتبکاتەوەو، گوتی: (بەڵام...)

کەچی (ماری) نەیهێشت قسەکەی تەواو بکات و، گوتی: (ناڕازی مەبە بابە، خۆ دەرکەوتووە لوسیان لە کارەکانیدا زۆر شارەزاو سەرکەوتووە)!

(جۆرج) هاتەوە نێو قسەکانیان و، گوتی: (خاتوونەکەم تۆ ڕایەك دەردەبڕی، ئەمە وا لە بابت دەخوازێت، ماوەیەکی باش لە هەموو ڕووێکەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات، جا ئایا ڕازی دەبێت لە سەرەنجامدا، یان نا)!

(جاك) بەم قسەیەی (جۆرج) گرژینەوەیەك پەڕیە سەر لێوی و، بە (ماری)ی کچی گوت: (ها ماری بینیت؟! من بە شێوەیەکی سەرەتایی ڕازی دەبم، بەڵام پێویستیم بە ماوەیەکی باش هەیە، بۆ ئەوەی لە هەموو ڕووێکەوە لەو مەسەلەیە بکۆڵمەوەو، بزانم چۆن ئەوە بکەم)!

دوای ئەوە (ماری) داوای لە (ئیتیان)ی وێنەکێش کرد، چەند تابلۆیەکی بۆ بکێشێت، ئینجا لەگەڵ (جاك)ی باوکی هەڵسان ڕۆیشتن.. کە لە ژوورەکە چوونە دەر و، بە تەنیا مانەوە، (ئیتیان) بە (جۆرج)ی گوت: (لێتی ناشارمەوە من زۆر لە بۆل هرمان دڵنیا نیم!! نەتدیت چۆن دەیویست ڕای کچەکەی لە بارەی لوسیانەوە بگۆڕێت)؟!

- (بەلام ئەو ئەو کچەی خۆی خۆشدەوێت، ئەوەندە هەیە بە ئەرکی خۆیشی دەزانێت، بیر لەوە بکاتەوە کە بە قسەی کچەکەی لوسیان بکاتە هاوبەشی خۆی، یان نا)!

- (ڕاستە، بەلام زۆر بە کەمی هەستی من هەڵە دەکات، دەشێ ئەو پیاوە لەوانە بێت، کە شارەزان و لە کاردا چالاکن، بەلام ئەوەی دەیشارێتەوە، جیایە لەوەی دەیڵێت)!

## ١٩- (جارێکی تر ئۆفید سۆلیڤۆ):

(بۆل هرمان) لە سەرەنجامی خۆشەویستییەکەی (ماری)ی کچی بۆ (لوسیان لابرۆ) دەترسا، ئەو ترسەیشی ئەو کاتە زیاتر بوو، کە نامەیەکی لە (ئۆفید سۆلیڤۆ)وە پێگەیشت، تیایدا (ئۆفید) پێی ڕاگەیاندبوو، کە لە قوماردا کارگەکەی دۆڕاندووەو، بۆ داوای یارمەتی کردن لێی، دێتە فەرەنسا بۆ لای!

ئەو ڕۆژەش، کە (بۆل) لە ژووری نووسینگەکەی خۆی لە نێو کارگەکەیدا دانیشتبوو، لە پڕێکدا (ئۆفید) لێی بە ژوور کەوت و، پێی گوت: (چییە ئەوە کوڕە خاڵۆکەم؟! بۆچ بە بینینی من سەرسامیت)؟! (بۆل) لە هەموو کاتێك زیاتر شڵەژا! زۆریش بەو دیدارە ڕەشبین بوو، بۆیە گلەیی لە (ئۆفید) کرد، لەسەر بە هەند هەڵنەگرتنی کارگەکەی و، دۆڕاندنی، بەلام (ئۆفید) گوتی: (بەلام

کوڕە خاڵۆی ئازیزم لە بیری مەکە، بە تەنیا یەك وشەم بەسە بۆ لە نێو بردنی ژیانت)!

- (چییە ئەوە؟! گەڕایەوە سەر هەڕەشەکانت)؟!

- (نەخێر من هەڕەشەت لێ ناکەم.. پەنا بەخوا لەوە، بەڵام هەموو ئەوەی مەبەستمە دەمەوێت، لە کارگەکەی خۆت کارێکم پێ بکەیت)!

- (تۆ پێت نایەتە ناو کارگەی من.. چونکە بەڕێوەبەری کارگەکەم کوڕی ئەو پیاوەیە، کە کاتی خۆی کوشتوومە، بۆیە دەترسم ڕۆژێکیان شتێکت لە دەم دەرچێت و، ڕیسوام بکەیت)!

- (کەوابێت، تۆ دەزانی بێدەنگ بوونم، چەند گرنگە)؟!

(بۆل) چیتر بەرگەی ئەم شەڕپێ فرۆشتنەی (ئۆفید)ی نەگرت، بۆیە بەسەریدا قیژاند: (تۆ وادەزانیت، من لەژێر دەستی تۆم، نەخێر ئۆفید سۆلیڤۆ، تۆ ئەگەر نهێنی من ئاشکرا بکەیت، ئەو کاتە من خۆم دەکوژم و، بەوەش هیچ قازانج ناکەیت).

(ئۆفید) زانی ئەم قسەیەی (بۆل) مانای چییە، بۆیە بێدەنگ بوو و، دوای کەمێك بە هێمنی و نەرمییەوە گوتی: (بەڵام بۆل.. تۆ ناتوانی واز لە من بێنیت)!

- (بێگومان واز لە تۆ ناهێنم.. بەڵکو مووچەیەکی ساڵانە دوانزە هەزار فرەنکیت بۆ دەبڕمەوە، هەروەها پێنج هەزار فرەنکی تریشت پێ دەدەم، بچۆ لە دەوروبەر بۆ خۆت خانووێکی بچوکی پێ بکڕە، هەر کاتێك ویستم، من دێمە سەردانت بۆ ئەوێ، بەڵام تۆ بە هیچ شێوەیەك نەیەیتە کارگە بۆ لام)!

ـ (دڵخۆشت کردم.. بۆیە منیش هەمیشە خزمەتکارم)!

دوای ئەوە (بۆل) پارەکەی پێداو، (ئۆفید) ڕۆیشت.

پاش ئەوەش (بۆل) بەو گەڕانەوەیەی (ئۆفید سۆلیڤۆ) هەمیشە ناڕەحەت بوو، وای لێهاتبوو بیری دەکردەوە، دەیگوت: (ئێستاکە سێ کەس لەو شارەدا کۆبوونەتەوە، هەریەکەیان سەرچاوەی هەڕەشەیەکی گەورەنە بۆ من، ئەوانیش: حەننەو، ئۆفید سۆلیڤۆ و، لوسیانن، بەڵام هەمیشە دوای کەمێك بیرکردنەوە، دڵی خۆی بەوە خۆشدەکرد، دەیگوت: (حەننە دەگیرێتەوەو، دەخرێتەوە بەندیخانە.. ئۆفید سۆلیڤۆش هەتا پارەی پێ بدەم، قسەم لەسەر ناکات.. لوسیانیش خۆی بە قەرزاری من دەزانێت، کە داممەزراندووە، بۆیە قەت گومانم پێ نابات)!

## ٢٠ـ (ماری دەڵێت من شوو دەکەم):

ڕۆژێکیان (ماری) هاتە لای باوکی و، پێی گوت: (هەست دەکەم ئازارێکی زۆر دەچێژم)!

(بۆل) ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو، گوتی: (دیسان سینگت دێشێتەوە)؟!

ـ (نەخێر.. بەڵکو ئەمجارەیان دڵم دێشێت.. بەڵێ بابە، من وامزانی تۆ هەستت پێکردووە، بەڵام قەیناکات خۆم پێت دەڵێم: من هێندەم لوسیان خۆشدەوێت، ناتوانم وەسفی ئەم خۆشوویستنەم لە بۆ ئەوت بۆ بکەم، ئەوەتا خۆشەویستییەکەی تێکەڵی خوێنم بووەو، وام

لێهاتووە ناتوانم، بە بێ ئەو بژیم.. خۆ ئەگەر ڕەتیشی بکەیتەوە شووی پێ بکەم، ئەوە وەکو ئەوەیە بڕیاری مردنم بەسەردا بدەیت)!

ـ (کچم.. من ئامادەم هەرچییەك بکەم، کە تۆ دەتەوێت، بەڵام شوو کردنت بە لوسیان، ئەوەیان نابێت).

(ماری) ئەم قسەیەی بە دڵ نەبوو، چاوەکانی لێکنان و، خەریك بوو دەبووڕایەوە، تا پاش کەمێك بە تەواوی لەخۆچوو.. باوکی کە بینی کچەکەی وایلێهات، زۆری پێ ناخۆشبوو، هەڵسا بردیەوە سەر قەرەوێڵەکەی خۆی و، کاتێك هاتەوە خۆ، پێی گوت:

ـ (کچی خۆم ماری.. ئەگەر ئاسوودەیی تۆ لەوەدا بێت، شوو بەو کوڕە بکەیت، ئەوا منیش ڕازیم).

ـ (نەك هەر ئاسوودەییم، بەڵکو هەموو ژیانم بەو کوڕەوە بەندە، دڵنیاشم ئەگەر وا بکەیت لوسیان ڕێی بۆ خۆش بێت بێتە داخوازیم و، پێیم بدەی، چاك دەبمەوەو، نەخۆشیەکەشم نامێنێت).

(بۆل) دوای ئەوە، کە لەوە دڵنیابوو، کچەکەی گەڕاوەتەوە باری ئاسایی خۆی، جێی هێڵاو، ئینجا بەرەو کارگەکەی هات، لەوێ (لوسیان)ی بینی و، پێی گوت: (من سەرسامم بەو هەموو لێهاتوویی و چالاکییەی هەتە، لە نێو کارگە، منیش پیاوێکم هیچ هەنگاوێك هەڵناگرم، تا لە هەموو لایەنێکەوە لێینەکۆڵمەوە، جا ئێستا گەیشتوومەتە ئەو ڕایەی پێویستیم بە یەکێکی وەکو تۆ هەیە، لەگەڵ خۆمدا بیکەمە هاوبەش لە کارو کارگەکانم، جا چ دەڵێیت؟ ڕازی دەبی)؟

ـ (من ببمە هاوبەشی تۆ؟! باشە ئەمە چۆن دەچێتە ئەقڵەوە)؟!

ـ (گوێبگرە لوسیان.. من نەبوومە خاوەنی ماڵ و سامان، تا ئەو ڕۆژەی نەبوومە هاوبەشی جیمس مۆرتیمەرو، کچەکەی ئەوم نەهێنا)!

(لوسیان) لە مەبەستی (بۆل) گەیشت، پێی گوت: (مەبەستت ئەوەیە خاتوو ماری ببێتە خێزانی من)؟!

ـ (بەڵێ).

ـ (سوپاست دەکەم بەڕێز بۆ ئەو هەموو متمانەیەی پێمی دەبەخشی، بەڵام من سوێندم خواردووە کچێکی تر بێنم)!

ـ (چییە ئەوەی دەیهێنی دەوڵەمەندە)؟

ـ (نەخێر، بەڵکو کچە هەژارێکی زۆر داماوە)!

ـ (کەوابێت کوڕی خۆم لەو مەسەلەیە پەلە مەکە.. ئاسوودەیی دەرگای بۆ خستوویەتییە سەر پشت، تۆش هەروا بە ئاسانی ڕەتی مەکەوە، کچەکەم نەخۆشە، تۆی زۆر خۆشدەوێت و، دڵنیابە تۆ ڕەتی بکەیتەوە، ئەو دەمرێت).

بەڵام ئەمەش (لوسیان)ی نەرم نەکرد، بۆیە داوای یارمەتی کردو، (بۆل)ی جێهێشت.. هەرچی (بۆل هرمان)یشە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: (ئەو کوڕە دەبێتە هۆی مردنی کچەکەم! بەڵام من نایێڵم ببتە هۆی ئەوە)!

هەرچی (ماری)یە، ئەو کاتە لەگەڵ (لوسی) بوو، کە ئەوەی دووەم هاتبووە لای، بۆ ئەوەی فیستانە نوێکەی بۆ بگرێت، بەڵام هەرهەندە

(لوسی) چووە دەرو، (ماری) وادەی دایێ لە ژوورەکەیدا بچێتە سەردانی، (بۆل) هاتەوە ماڵ.

که (ماری) چاوی بە باوکی کەوت، یەکسەر مەسەلەی (لوسیان)ی لێ پرسی.. باوکی لە وەڵامییدا گوتی:

- (بە ئاماژە تێم گەیاند، کە حەزدەکەم ماری کچم بهێنیت، بەڵام لەبەر ئەو جیاوازییەی لە نێوانتاندایە، ئەو ڕازی نەبوو).

- (ئەدی دوای ئەوەی قسەت بۆ کرد، کە ئەو جیاوازیانە شتێکی وەها نین، ماری بیانکاتە کۆسپ، هەر ڕازی نەبوو)؟!

- (با بێگومان، ئەو کاتە ڕازی بوو، بەڵام گوتی ئێستا ئەو باسە دوا دەخەم، چونکە داهێنراوێکم بە دەستەوەیە، بەڵکو جارێ ئەو تەواو بکەم، ئینجا دوای ئەوە ئەگەر داوای ماری بکەم، ئاساییە).

- (بەڵام باشە گوتی: منیش ماریم خۆشدەوێت)؟!

- (بە ڕاشکاوی ئەوەی نەگوت، بەڵام چاوەکانی ئەوەیان لێ دەخوێنرایەوە)؟!

- کەوابێت بەردەوام هامووشۆمان دەکات، بەڵام تکا دەکەم وەکو خزمەتکارێکی لای خۆت مامەڵەی لەگەڵدا نەکەیت، بەڵکو بەو چاوە تەماشای بکە، کە بەیانی کچەکەت دەخوازێت).

- (بەسەرچاو ئازیزەکەم).

## ٢١- (بیروبۆچوونەکانی بۆل هرمان):

لـه ڕۆژی دووەمـدا (بـۆل) چـووە کارگەکـەی و، لەگـەڵ (لوسـیان) کۆبوویـەوە، خۆشەویستییەکی زۆری بۆ نواند، (لوسیان) دوای ئەوەی ڕەتی کردبۆوە، کچەکەی بخوازێت، چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەدەکرد!

دوتـر (بـۆل) گوتـی: (داوات لـێدەکەم: بـە نوێـنەرایەتی مـن بـە سـەردانێکی پانـزە ڕۆژی بچـیتە بەلگـراد، بـۆ ئـەوەی لـەوێدا لەگـەڵ کۆمپانـیایەکی پیشەسازی ڕێککەوتن بکەیت، لە بڕی ئەوەش جگە لە مووچەکەت، پێنج هەزار فرەنکت سەربار پێ دەدەم).

- (مـن کـە ئەو کارە ئەنجام دەدەم، بەشێکە لە ئەرکەکانی سەرشانم، بۆیە ئەو پێنج هەزارەی لە بەرامبەردا پێمی دەدەیت، یەکجار زۆرە)!

- (بـا زۆر بێت!! من خۆم دەمەوێت ئەو پاداشتەت پێبدەم، بۆیە تۆ لـە ئێستاوە خـۆت بـۆ ئـەو سـەفەرە کۆبکەوە، بەڵام لە بیرت نەچێت، هـەموو ڕۆژێـك نامەیـەکم بـۆ بنووسـیت، کـە چـیت کـردووە، گەیشتوویەتیە چی).

دوای ئـەوە (بـۆل هـرمان) گەڕایـەوە نووسـینگەکەی خۆی و، کەوتە بیرکـردنەوە: ( ئێسـتا لـە مـاوەی لـێرەنەبوونی لوسـیاندا، مـن دەتوانم ئاواتەکـەی خـۆم بێـنمە دی، بـەڵێ.. دەبـێ ئـەو کچـە بکوژم، کـە ئـەو حـەزی لێدەکات و، بـڕیارە بیهێنێـت، چونکە من لە پێناو ئاسوودەیی کچەکەم، کوشـتنم زۆر بە لاوە ئاساییە، بۆ ئەو مەبەستەش کەسی لە ئۆفـید سۆلیڤۆ باشـترم دەسـت ناکەوێـت، چـونکە ئـەو بۆ پارە هەموو شتێك دەکات).

لەم پێناوە بۆ ئێوارە (بۆل هرمان) هاتە ماڵی (ئۆفید سۆلیڤۆ)و، پێی گوت: (دێتەوە بیرت؟ گوتت: من بۆ خزمەتت ئامادەم).

ـ (ئەدی ئەی کوڕە خاڵۆم، من وادەی خۆم چۆن لە بیر دەکەم)؟!

ـ (کەوابێت کاتی ئەوە هاتووە ئەو وادەیەی خۆتم بۆ بێنییە دی).

ـ (ئەگەر فەرمانم پێ بکەیت، ئاگرێکی وەکو ئاگرەکەی فۆرتفیلیشت بۆ بکەمەوە، ئامادەم بۆتی بکەم).

ـ (ئاخەر من داوای لە ئەو زیاترت لێدەکەم، دەمەوێت کەسێکم بۆ بکوژی)!

ـ (کەسێکت بۆ بکوژم؟! بەڵام من قەت حەزم نەکردووە شتی وەها بکەم)!

ـ (ئاخەر ئاقڵ بە.. ژیانی من بەو مەسەلەیەوە بەندە، دەی ئەگەر من نەمام، کێ یارمەتیت دەدات)؟!

(ئۆفید) زانی، تازە دەبێت ئەو ئەرکەی بۆ جێبەجێ بکات، بۆیە ڕەزامەندی نواند.. ئینجا (بۆل) مەسەلەی (لوسیان لابرۆ) و، هۆگربوونی (ماری) کچی پێیەوەی و، ڕەتکردنەوەی (لوسیان) بە هێنانی (ماری)ی بۆ باسکرد، دوای ئەوە باسی ئەو کچەشی بۆ کرد، کە (لوسیان) خۆشی دەوێت و، بڕیاری داوە بیهێنێت، بۆیە داوای لە (ئۆفید) کرد، لە بەیانییەوە بەر لە ڕۆیشتنی (لوسیان) چاوەدێری بخاتە سەر (لوسیان) و، بزانێت ماڵی ئەو کچە خۆشەویستەی کامەیە، دوای ئەوەش چاوەدێریی بخاتە سەر کچەکەو، لە کاتێکی گونجاودا

بیکوژێت، (ئۆفید)یش لە بەرامبەر پارەیەکی زۆر وادەی دا درێغی نەکات.

هەرچی (ماری)یە، لەو کاتەدا بە هۆی ئەو هەواڵەی لەبارەی سەفەرکردنی (لوسیان)ی خۆشەویستی بۆ دەرەوەی وڵات، غەم دایگرتبوو و، لە داخان بە بێزاری لە دارستاندا پیاسەی دەکرد.

## ٢٢ـ (ئۆفید چاوەدێری دەخاتە سەر لوسیان و لوسی):

بەیانی ڕۆژی یەکشەممە، واتە بە ڕۆژێك بەر لە سەفەرەکەی (لوسیان)، (ئۆفید) چاوەدێری خستە سەری و، بە دوایدا چوو، کە ئەو دەهاتە ماڵی (لوسی)ی خۆشەویستی، بۆ ئەوەی پێی ڕابگەیێنێت، کە بەیانی دووشەممە بە سەفەر دەڕوات.

(لوسی) پێی گوت: (ئەگەر ئەم سەفەرەت سوودێکی بۆ خۆت تیا بێت، زۆر ئاساییە بڕۆ).

ـ (بێگومان.. لەو بڕوایەش دام، لیزای بێوەژن لە ماوەی نەبوونی من لێرەدا لەپاڵتدا دەبێت).

ـ (ناتوانێت ئەوەم لەگەڵدا بکات، چونکە خاوەن ئەو نانەواخانەیەی لیزا کاری لەگەڵدا دەکات، نەخۆشەو، ئەویش ناچارە لە لای ئەو بێت.. بەڵام بە هەر حاڵ، من ئومێدم وەهایە دوای ئەوەی ماڵی خۆمان دادەنێین، ئەو داماوە لەگەڵ ئێمەدا بژیت).

ـ (منیش هەر ئەوەم پێ خۆشە، بەڵام بە ڕاستی من لە هەندێ هەڵسوکەوتی بۆل هرماندا زۆر پەستم)!

- (یانی ئاسوودە نیت بە کارکردنت لەگەڵی)؟

- (با، بەڵام هەندێ شتی هەیە نارەحەتم دەکات، کە دواتر باسیانت بۆ دەکەم).

لێرەدا پاسەوانی ماڵەکە بانگی (لوسی)ی کردو، پێی گوت: (یەك لە خانمە ئاغاکان هاتۆتە سەردانت).. کەمێك دوای ئەوە (ماری) لێی وەژوور کەوت، بەڵام کە بینی (لوسیان) لای (لوسی)یە چاوی تاریك بوو، لەوەش خراپتر، بینی (لوسی) پێی دەڵێت: (ئەوە ئەو کورە لاوەیە، کە پێشتر لە بارەیەوەی قسەم بۆ کردیت، گوتم دوو ساڵە یەکترمان خۆشدەوێت و، بە هۆی چاکەکانی باوکت و، دڵسۆزی لوسیان بۆ کارەکەی ماوەیەکی تر ماڵ پێکەوە دەنێین).

بەڵام کە (لوسی) شڵەژانی (ماری)ی بینی، سەری سوڕما؟! پێی گوت: (چییە ئەوە خاتوونەکەم؟! ناتەوێت دابنیشی)؟!

(ماری) بەسەرخۆی نەهێناو، دانیشت، بەڵام دوای کەمێك هەڵسایەوەو، ویستی بڕوات، بە (لوسی)ی گوت: (ئێستاکە ئەو ماندووبوونەم بەسەرچوو، کە بە هۆی سەرکەوتنم بەسەر پێبلکەکان تووشم هات، بۆیە دەبێت بڕۆم، هیوادارم ژیانێکی خۆش بەسەر ببەیت).. دوای ئەوە (ماری) سەیری (لوسیان)ی کردو، پێی گوت: (بە هۆی بوونت لێرەوە، سەرسامی باوکم لە هی من گەورەتر دەبێت)!!

(لوسیان) پێی گوت: (من هەموو ئەو شتانەم بە باوکت گوت، کە دەبوو پێی بڵێم).

(ماری) گوتی: (باشە، بە هیوای ژیانێکی خۆش) و، ڕۆیشت.

بەلام (لوسیان) بە (لوسی)ی گوت: (ئەو کچە هەژارە بە هۆی سەرکەوتنی لەسەر ئەو پێبلکانەوە زۆر ماندوو ببوو)!! (لوسی)ش هاوڕای بوو و، دوای ئەوە پێکەوە بۆ پیاسە هاتنە دەر.

هەرچی (ئۆفید)ە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: (ئێستا ماڵی کچەم دۆزیەوەو، لەسەرمە بچمەوە لای بۆل هرمان بۆ هەنگاوی ئایندەم نەخشەی لێ وەربگرم.. بەلام چی ماریی هێنایە لای ئەمانە)؟!

(ماری)ش کاتێك گەڕایەوە ماڵ، بەخێرایی خۆی کرد بە ژوورەکەی بابی.. کە باوکی شڵەژان و ڕەنگ زەردهەڵگەڕانەکەی کچەکەی بینی مووچڕکی بە گیاندا هات و، دڵی ترسا!! (ماری) پێی گوت:

ـ (تۆ دەستخەڕۆت کردم بابە!! ئەو کچەت لێشاردمەوە، کە لوسیان خۆشی دەوێت و، دەیەوێت بیهێنێت)!

باب دەستی کچەکەی گرت و، پێی گوت: (ڕاستە لوسیان ئەو کچەی خۆشویستووە، بەلام وادەی پێدام، لە پێشنیارەکەی منیش بکۆڵێتەوە، بۆیە دڵنیابە هەر ڕازی دەکەم).

ـ (وام لێهات تا چەند ڕق لەو کچە، یان ئەو چەتیمەی لە خان گەورەبوو هەڵبگرم؟! کە تەنانەت ناویشی نەبوو و، بە چەتیمەکەی ژمارە نۆ بانگیان دەکرد)!

ـ (ماری دڵنیابە ئەو چەتیمە هاوڕێیەتی، نەك دەزگیرانی، ئەگینا من سوێندت بۆ دەخۆم: ناهێڵم بێجگەی تۆ بهێنێت).

کەمە ئارامییەك گەڕایەوە دڵی (ماری).. لەولاوەش (جاك)ی بابی لەسەر ڕاکەی سووربوو، کە هیچ چارێکی تری نییە، هەر دەبێت ئەو

کچە بکوژێت، کە دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە ئاسوودەیی و گیانی کچەکەی!

لەو کاتەدا (لوسی) و (لوسیان) گەڕانەوە ماڵ و، بینیان بێوەژنە (لیزا) لەوێیە، (لیزا) پێی گوتن، کە تەندروستی ژنە خاوەن نانەواخانەکە بەرەو خراپییەو، ناچارم دەبێ لە تەکی بم، بەڵام لەگەڵ ئەوەش وادەی بە (لوسی) دا، کە لە ماوەی سەفەری (لوسیان) ئەوەندەی هەلی بۆ بڕەخسێت، بێتە سەردانی.

هەرچی (ئۆفید)ە، ئەویش گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی و، چاوەڕوانی هاتنی (بۆل هرمان)ی کرد، کاتێکیش هات، (ئۆفید) پێی گوت: (ماڵی کچەم دۆزیەوە، بەڵام پێم سەیرە! بینیم ماری هاتە سەردانی)!

(بۆل) وەڵامی دایەوە: (کەوابێت: ئەو کچە ئەو بەرگدرووەیە، کە لای خاتوو ئۆگستین کاردەکات، لە شەقامی سانت ئونوریە)؟!

- (بەڵام ئەگەر من توانیم لوسی بکوژم و، خانەوادەکەی شکاتیان لێ کردم و، پۆلیس بە دوامدا گەڕا، ئەوسا چی بکەم)؟!

- ترسی ئەوەت نەبێت، ئەو کچە هەتیودو، کەسی نییە)!

- (کەوابێت ئاسانە، لە بیری پیلانێکی گونجاو دەبم و، هەوڵ دەدەم هەر بەیانی تەواوی بکەم)!

- (بۆ ئەمە چەندت پارە پێویست دەبێت)؟

- (جارێ بیست هەزار فرەنکم بدەرێ بۆ ئەو کارە، بەڵام هەرچی ئەو هەقەی خۆمە، کە لە بەرامبەر ئەو کارەدا لێتی وەردەگرم، ئەوە دوای ئەنجامدانی کارەکە لێتی داوا دەکەم).

ـ (باشە، ئەوەی ئێستا گوتت دەتدەمێ و، دڵنیابە دواتریش چەندی ویستت، پێتی دەدەم).

دوای ئەوە (بۆل) ڕۆیشت و، (ئۆفید)یش مایەوە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: (ئەوە جگە لە تاوانە کۆنەکەی بۆل، ئێستا نهێنی تاوانێکی نوێشی دەکەوێتە بەر دەستم)!

## ٢٣ـ (پیلانی تاوانەکە):

(ئۆفید) دەبوو لە ماوەی دوو هەفتە، یان ئەوپەڕەکەی سییان تاوانەکەی خۆی ئەنجام بدات، بۆیە دەست بەجێ کەوتە خۆی و، خۆی لە بەرگی حەمباڵێك شاردەوە، هات پرسیاری لە بارەی (لوسی)یەوە لەو ژنە پاسەوانە کرد، کە پاسەوانی ئەو ماڵە بوو، کە (لوسی)ی تیا دادەنیشت، لەویش بۆی دەرکەوت، کە (لوسی) ناچێتە کارگە بەڵکو هەر لە ژوورەکەی خۆی بەرگدروویی دەکات.

بۆ زیاتر دڵنیاییش (ئۆفید) هاتە کارگەو، لەوێش لە یەك لە کچەکان پرسیار (لوسی)ی کرد.. سەرەنجام تێبینی ئەوەی کرد، کە ئەو کچەش (لوسی)ی خۆشناوێت، چونکە کە ناوی (لوسی)ی برد، بینی کچە لچی هەڵێناو، گوتی: (حەز ناکەم گوێ بیستی ناوی بم).. بەمەش (ئۆفید) دڵخۆشبوو و، لە دڵی خۆیدا گوتی: (پێویستە سوود لەو کچە وەربگرم)!

بـۆ ئـێوارە (ئۆفـید) هاتـەوە کارگـە، تـا ئـەو کاتـەش هـەر بـەرگی حـەماڵی لـە بـەردابوو، لـە ژنــە پاسـەوانەکەی پرسـی: (ئـاخۆ کچـە بەرگدرووەکان کەی دەگەڕێنەوە)؟

وەڵامـی دایـەوە: (بـێگومان تـۆ شـتێکت هەیـە، بۆیـە ئـەو پرسـیارە دەکەیت)؟!

- (نەخێر خاتوون.. بڕوا بکە لەوانە نیمە حەز بکەم بە دوای کچان بکـەوم، بـەڵام مـن لـە لایـەن یـەك لـە پـیاوە بەڕێـزەکان بـە کـارێك ڕاسپێردراوم)!

ئیـنجا فڕەنکـێکی دەرهێـناو، بـە ژنـە پاسـەوانی دا، ژنە پاسەوانیش پـێی گـوت: (کچانی ئێرە لە هەشتی ئێوارە دەردەچن).. ئینجا وەسفی کچەکانی بـۆ کـرد، بـەوە (ئۆفـید) تێگەیشت، ئەو کچەی دانی بەیانی قسەی لەگەڵ کردووە، ئەوە (ئەماندا) بووە.

(ئـەماندا) کچێکی جوانـی تەمـەن بیست و دوو سـاڵی بـوو، خـەوی بەو کوڕەوە دەدیت، کە بێتە داوای و، لە هەژاری ڕزگاری بکات!

بـۆ بـەیانی ڕۆژی دووەم، ژنــە پاسـەوان هـەواڵی دایـە (ئـەماندا)، کە یـەك لـە پـیاوە بەڕێزەکان خزمەتکارەکەی خۆی ناردبوو پرسیاری لە بـارەی تـۆوە دەکـرد.. (ئەماندا)ش بەمە زۆر دڵخۆشبوو، ئێوارە کە لە کارگـە هاتــنە دەر، هەسـتی کـرد پـیاوێکی تەمــەن پـەنجا سـاڵە بــە دوایەوەیـە، لـە دڵی خۆیدا گوتی: (ئەگەر ئەو بەڕێزە لە بارەی منەوە پرسـیاری کردبێـت، بـا لـە منـیش بـە تەمـەنتر بێـت، پێی ڕازی دەبم،

بەڵام بەو مەرجەی لەو هەژاریەم ڕزگار بکات و، وام لێبکات ئیتر پێویستیم بە ئیشی کارگە نەمێنێت)!

لەو بیرکردنەوەیە بوو، پیاوەکە (کە وەکو ئاشکرایە نۆفید بوو) لێی هاتەپێش و، سلاوی لێکرد.. (ئەماندا) لێی پرسی: (چیت لێم دەوێت)؟!

(نۆفید) وەلامی دایەوە: (من تۆم خۆش دەوێت، هیچ عەیبیش نییە لەگەڵم بێی، چونکە من بە تەمەنم و، نزیکەی پەنجا ساڵەم).. ئینجا بە ناوی خۆی بانگی کردو، داوای لێکرد لەگەڵی سوار بێت، واشی تێگەیاند، کە لەمێژەوەیە هەوڵ دەدات، ناشنایەتی لەگەڵدا دروست بکات.. دوای ئەوە بردی پێکەوە نانی ئێوارەیان خواردو، پاشتریش گەیاندییەوە ماڵەکەی خۆی، لەگەڵیشی ڕێککەوت، کە نیوەڕۆی ڕۆژی دووەم، لە یەکێ لە چێشتخانەکان بگەنەوە یەك.

بۆ بەیانی ڕۆژی دووەم، لە چێشتخانەکەدا پێکەوە نانی نیوەڕۆیان خوارد، دوای ئەوە (ئەماندا) داوای لێکرد ڕێگەی بدات بڕوات، بۆ ئەوەی کراسێك بباتە لای یەك لە کچە بەرگدرووەکان بۆ ئەوەی بیدوورێت.. (نۆفید) پرسی: (ئەو کچە بەرگدرووە کێیەو، لە کوێ دادەنیشێت)؟

ـ (لە شەقامی بۆربۆن، ژمارە: ٩).

بەمە (نۆفید) زانی، (ئەماندا) دەچێتە لای (لوسی)، بۆیە داوای لێکرد، لەگەڵی بچێت، ئەویش ڕازی بوو، ئیتر (نۆفید) (ئەماندا)ی گەیاند، لەوێ (ئەماندا) دابەزی چووە لای (لوسی) و، (نۆفید)یش لە

دەرەوە چاوەڕوانی کرد، تا کاتێك (ئەماندا) گەڕایەوە، (نۆفید) لێی پرسی: (ئەو کچە ناوی چی بوو، کە بۆ لای چوویت)؟

(ئەماندا) وەڵامی دایەوە: (ناوی لوسییە) و، هەندێ وەسفی بۆ کرد، ئینجا گوتی: (خاتوو ئۆگستین متمانەی زۆری پێدەکات، بۆ نمونە سبەی نا دووسبەی لوسی دەچێتە کارین دو کۆلۆمب، بۆ ئەوەی ئەو جلە تاقی بکاتەوە، کە بۆ ژنی پارێزگاری دووریوە)!

- (جا ئایا بە تەنیا بۆ ئەو شوێنە دوورە دەچێت)؟!

- (من لەگەڵی دەچم، لە وێستگەی شەمەندەفەری سانت لازار سواردەبین و، لە وێستگەی دارستانی کۆلۆمب دادەبەزین، دواتر بە ڕێگەیەکی بە ترس بۆ ماڵی پارێزگار دەچین، لە پاشانیش کە ئیشمان تەواو کرد، بە شەمەندەفەری کاتژمێر دەی شەو دەگەڕێینەوە).

(نۆفید) گوایە لە سەرکەوتنی پیلانەکەی نزیك بووەوەو، پێکەنین کەوتە سەر لێوی، بەڵام بۆ ئەوەی ئەو بارەی بشارێتەوە، بە (ئەماندا)ی گوت: (من وا هەست دەکەم: تۆ پاش ماوەیەکی تری نزیك لەو بەرگدروویە ڕزگارت دەبێت و، دەحەسێیتەوە، چونکە ئەو بەرگدروویە زۆر بە ماندووبوونەو، بێ مەترسیش نییە)!

## ٢٤- (لوسیان لە بەلگراد دا):

لە بەلگرادا (لوسیان) هەمیشە بیری لە (لوسی)ی دەزگیرانی دەکردەوە، بەڵام وێنەی (ماری) داماویشی لە بیر نەدەچووەوە، لە دڵی

خۆیدا دەیگوت: (پیاوەتی وا دەخوازێ، من وا لەو هەژارە بگەینم، کە گوایە خۆشم دەوێت، بۆ ئەوەی ئەو چەند ڕۆژەی ماویەتی بە ئاسوودەیی بەسەرببات.. دوای ئەوە نامەیەکی بۆ (بۆل هرمان) نووسی و، لە پەراوێزیدا داوای لێکرد: (گەورەم تکا دەکەم سلاوو ڕێزم بگەیەنییە خاتوو ماری، چونکە من بە ڕاستی قەرزاری مە، لەوەی کەوا ئەو هەموو متمانەیەی بۆ دروستکردم).

(بۆل هرمان) بەم نامەیە زۆر دڵخۆشبوو، بۆیە یەکسەر بۆ (ماری) کچیشی خوێندەوەو، پێی گوت: (وای بۆ دەچم ئەو چەتیمە لەبیر بکات)!

- (بەلام دڵی من دەڵێت: ئەو ئەم چەند وشەیەی لەو ڕووەوە نووسیوە، کە وەلامی چاکەم بە چاکە بداتەوە، دەنا من دڵنیام ئەو منی خۆش ناوێت).

- (ماری تۆ هەڵەیت! ئەو لەوەی لەو نامەیەی نووسیوە ناتوانێ زیاتر بڵێت، دواتر ئەو چەتیمە دەشێ نەخۆش بکەوێت و، بمرێت، بەوەش بە تەواوی لەبیر لوسیان دەچێتەوە).

- (من ئەوە بۆ ئەو کچە ناخوازم، ئەو چ تاوانێکی هەیە، بەلام من ئەوەندەیە ئەگەر لوسیان منی نەوێ، لە داخان دەمرم).

(بۆل) دڵخۆشی کچەکەی دایەوە، ئینجا چەند دێڕێکی بەم شێوەیەی بۆ (لوسیان) نووسی: (پەراوێزی نامەکەت شوێنەوارێکی گەورەی بەسەر مارییەوە دروستکرد، من سوپاسی ئەو سۆزەت دەکەم،

دەوای کچەکەم لە دەستی تۆیە، جا ئەگەر پێت دا، ئەوا ژیانت کڕیەوە، ئەگەرناش، ئەوا کەواتە دەیکوژی).

٢٥- (تاوان):

(نۆفید) کە بە (بارۆن ئارنۆڵد) ناسرابوو، ڕێگەی ماڵی پارێزگاری زۆر بە وردی پشکنی، هەواڵی بە (ئەماندا)ش دا، کە بەیانی پێکەوە نانی نیوەڕۆ ناخۆن.

دوای ئەوە (نۆفید) چووە کارگەی (جاك) و، پێی ڕاگەیاند، کە بەیانی ئەرکەکەی بەجێ دێنێت، چونکە (لوسی) بەیانی بە تەنیا دەچێتە لای ژنی پارێزگار، بێ ئەوەی (ئەماندا) هاوڕێیەتیی بکات، هەروەها داوای لە (جاك) کرد، کلیلێکی تایبەتی پێ بدات، بۆ ئەوەی شەو دوای ئەنجامدانی تاوانەکەی بۆ ئەوێ بگەڕێتەوە، بەو مەرجەی هەر لە زووەوە ئۆتۆمبێلەکەی لە پێش دەرگای کارگەکەدا بووەستێنێت، بۆ ئەوەی خەڵکان وا تێبگەن، کە شەو (نۆفید) لەگەڵ (جاك) لە کارگە بووە.. هەروەها لەسەر ئەوەش ڕێککەوتن، کە (نۆفید) کاتژمێر شەشی ئێوارە بێتە کارگە، دواتر لە دەرگایەکی تایبەت، بە نهێنی بچێتە دەرو، لە پاش ئەنجامدانی تاوانەکەشی هەر بە هەمان دەرگا بگەڕێتەوە کارگە، لەوێدا (جاك) چاوەڕوانی بکات و، دوای ئەوە پێکەوە لە کارگە بچنە دەر، بۆ ئەوەی هیچ گومانێکی لێ نەکرێت.

(جاك)یش وای لە کچەکەی گەیاند، کە لەبەر سەرقاڵیی بە ئیشە زۆرەکانی شەو لە کارگە دەمێنێتەوە.

کاتژمێر شەش دوای ئەوەی (ئۆفید) لەوە دڵنیابوو، کە (لوسی) بە تەنیا دەڕوات، لە کارگە ئامادەبوو، خەنجەرێکی گەورەی لە ژێر کراسی دەرهێناو، بە (جاك)ی گوت: (کارەکە بەم خەنجەرە جێبەجێ دەکەم، کە لە دوکانێکی نزیك ماڵی لوسی کڕیومە).

هەرچی (لوسی)یە، سەر لە بەیانی چووبووە ماڵی پارێزەر، وادەشی بە ژنەکەی دابوو، ئێوارە دیسانەوە بێتەوە، تا دووبارە جلەکانی پێ بگرێتەوە، جا کە سەر لە بەیانی گەڕایەوە، چاوی بە (حەننە فۆرتیە)ی دایکی کەوت، کە بە بێوەژنە (لیزا)ی نانفرۆش دەناسراو، لێی پرسی:

- (خەریکی چی)؟!

(حەننە) وەڵامی دایەوە: (خاتوونی خاوەن نانەواخانەکەم نەخۆشیەکەی گەیشتۆتە بارێکی زۆر ترسناك، دەچم هەواڵی ئەوە بە دایکی دەدەم).

دوای ئەوە لێکجیابوونەوە، (حەننە) هاتە ماڵی دایکی خاوەن نانەواخانەکەو، هەواڵی سەختی نەخۆشی کچەکەی پێ ڕاگەیاند، بەڵام دایکە ڕەتی کردەوە بچێتە سەردانی کچەکەی، چونکە مێردی ئەو کچەی هەڵەی لە دەرهەق کردبوو، بۆیە بە (حەننە)ی گوت: (من نایێمە ماڵی ئەو کچەم، تەنها ئەگەر زاواکەم لە نامەیەکدا داوای لێبووردنم لێبکات).

بۆیە (حەننە) ناچاربوو گەڕایەوە نانەواخانەکەو، داوای لە مێردی خاتوونەکەی کرد، ئەو نامەی داوای لێبووردن کردنە بۆ خەسووەکەی بنووسێت، بەلکو دڵی نەرم بێت و، بێتە سەردانی کچە نەخۆشەکەی، کابراش سەرەتا کەمێك دوودڵ بوو، بەڵام دواتر نامەکەی نووسی، دایە (حەننە) و، (حەننە) جارێکی تر چووەوە لای پیرەژنەکەو نامەکەی بۆ برد، دوای ئەوەی پیرەژن نامەکەی خوێندەوە، بە (حەننە)ی گوت: (تکا دەکەم کەمێك چاوەڕێم بکە، ئێستاکە جلەکانم دەگۆڕم و، دەڕۆین).

ئەمە لە کاتژمێر دەو نیوی شەو بوو، هاوکاتیش بوو لەگەڵ گەڕانەوەی (لوسی) لە سەردانی ئێوارەی کە جاری دووەم بوو هاتبووەوە ماڵی پارێزگار، لە ڕێگاش (ئۆفید) خۆی لە نێوان داران شاردبووەوە، کە (لوسی) لێی نزیك بووەوە، (ئۆفید) بۆی دەرپەڕی و، خەنجەرێکی لێدا، بەمە (لوسی) بە زەویدا کەوت، ئینجا (ئۆفید) خەنجەرێکی تری لێ وەشاند، بەڵام ئەمجارە خەنجەرەکە بەر پارچە ئاسنێك کەوت و شکا، (ئۆفید)یش بە هەندی هەڵنەگرت، چونکە لەو بڕوایەدا بوو، کە ئەو خەنجەرەی جاری یەکەم لێیداوە بەسبووە بۆ کوشتنی، بۆیە ئیتر وازی لێهێنا، ئەوە نەبێ، کە چاوی بە کاتژمێرەکەی دەستی و ملوانکە زێڕەکەی کەوت، لێی کردنەوەو، دزینی، ئەمەش بۆ ئەوەی پۆلیس بە هەڵە ببات و، وای بۆ بچن بکوژ دزبووە، بۆیە هەڵی کوتاوەتە سەر ئەو کچەو کوشتوویەتی.

لــــەو ســــاتەدا (حەنـــــنە) و، دایکـــی خـــاوەن نانەواخانەکـــەو خزمەتکارەکەشـی بـەوێدا تێـپەڕین، کـە (نۆفـید) بینیـنی ڕایکـرد، ئەوانـیش هەرچـەندە بۆیـان نەناسـرا، بـەڵام بینـیان پـیاوێك ڕایکرد، هـەروەها گوێـیان لە دەنگی کچێکی زامداریش بوو، دەیناڵاند، بۆیە لە دەنگەکـە نــزیك بوونـــەوە، (حەنــنە) کـە چـاوی پـێکەوت، بیـنی (لوسـی)یـە، بـەوەش تـا هـێزی تـیابوو لە قیژەی داو، بە دایکی خاوەن نانەواخانەکەی گـوت: (ئەمـە تاوانـێکی گەورەیـە لـێرەدا کراوە، بەڵام سوپاس بۆ خـوا کچە نەمـردووە، بۆیـە ئـێوە فـەرموون بـڕۆنە مـاڵی خاتوونەکـەم، منیش لێرە بە دیار ئەو کچە زامدارەوە دەبم، بەڵام تکا دەکـەم بـە زوویـی پۆلیسم بۆ ڕەوان بکەن، تا بێن و، بە چاوی خۆیان ڕووداوەکە ببینن).

بـەم شـێوەیە پاش کەمێك ئەفسەرێك و چەند پۆلیسێك گەیشتن و، ئەفسـەرەکە (لوسـی)ی گوازتـەوە ماڵی خۆی، ئینجا کەوتە لێکۆڵینەوە لەگــەڵ (حەنـــنە).. ئـــەویش ئـــەوەی بینیـــبووی بـــۆ ئەفســـەرەکەی گێڕایەوە.. ئەفسەرەکە لە دەرەنجامی ئەو قسانە سەرەتا وای بۆ چوو، ئـەو تاوانـە بە پاڵنەری دزیکردن لە (لوسی) ئەنجامدراوە، ئیتر پارچە شـکاوەکەی خەنجـەرە دۆزراوەکـەی لای خـۆی پاراسـت و، ڕاپۆرتـێکی تێروتەسـەلی لـە بـارەی ڕووداوەکـەوە نووسـی.. هەرچی (حەننە)شە لـە مـاڵی ئەفسـەرەکە لـە تـەك (لوسـی) مایـەوە، پزیشـکیش هێـنراو، تیماری زامەکەی (لوسی)ی کرد.

بۆ ڕۆژی دووەم، لێکۆڵینەوە لە شوێنی ڕووداوەکە دەستی پێکرد، (لوسی)ش بەرەو باشی هات، بیری کەوتەوە شەوی پێشوو چی کردووەو، چۆن ئەوەی بەسەر هاتووەو، بۆ بێوەژنە (لیزا)، واتە: (حەننەی دایکی)ی ئەم قسانەی گێڕایەوە.. پزیشکیش بە (لوسی)ی گوت:

- (ئیتر مەترسیت لەسەر نەما، بەلام بزانە تۆ قەرزاری بێوەژنە لیزای، چونکە ئەگەر ئەو نەبووا، لەوانە بوو، تیا بچووبووایت).

هەرچی ئەفسەرەکەشە ناوی ئەو کۆگایەی لای خۆی نووسی، کە (لوسیان لابرۆ) تیایدا کاتژمێرێکی بۆ دەزگیرانەکەی کڕیبوو، بۆ ئەوەی ژمارەکەی بزانێت و، بەمە ئاسانتر دزە بناسێتەوە.

بێوەژنە (لیزا) دوای ئەوە یارمەتی لە (لوسی) خواست، بۆ ئەوەی کەمێك بچێتە ماڵی خاتوونی خاوەن نانەواخانەکەی، بۆ ئەوەی لە تەندروستی ئەویش دڵنیا بێت، بەلام کە گەیشتە ماڵەکەیان، مێردی خاتوونەکەی پێیڕاگەیاند، کە ئەو مردووە، بۆیە داوای لێکرد بچێتەوە لای کچە زامدارەکەی، چونکە ئەوڕۆژە نانەواخانە ناکرێتەوە.

٢٦ـ (لوسی چاك دەبێتەوە):

خـاتوو (ئۆگسـتین) بـە دواكەوتـنی (لوسـی) نـیگەران بـوو، بۆیـە (ئـەماندا)ی بـە دوادا نـارد، تـا هەواڵێكی لـە بارەوەی بۆ بێنێتەوە، لە ڕێگا (ئۆفید) هاتە پێشی و، پرسیاری لێكرد:

- (بۆ كوێ دەچیت)؟

- (خـاتوو ئۆگستین بە دوای لوسیدا ناردوومی، بۆ ئەوەی بزانم چی بەسەر هاتووە، بۆچ نەگەڕاوەتەوە)؟

- (بۆچی لوسی چی بەسەرهاتووە)؟!

- (شەو چۆتە ماڵی پارێزگارو، تا ئێستا نەگەڕاوەتەوە)!

بەمـە (ئۆفـید)یـش خـۆی بـە پـەرۆش پیشـانداو، بـە گـەڵی كـەوت.. (ئەماندا) سەرەتا هات لە خاوەنی ئەو ماڵەی پرسی، كە (لوسی) لایان ژوورێكی بەكرێگرتبوو، پێی گوت:

- (ئایا ئەمڕۆكە لوسیت دیتووە)؟

خـاوەن مـاڵ وەڵامـی دایـەوە: (نەخـێر.. تەنانەت نازانم لەبەرچیش وا بەم شێوەیە دواكەوتووە)!

هەرچـی (لوسـی)شـە كـە بـەردو باشـی هاتـبۆوە، داوای لـە بـیۆەژنـە (لـیزا) كـرد، بچـێتە ماڵەكـەی لە پاریس، بە پاسەوانەكەیان بڵێت، كە ئـەو شتێكی وای بەسـەرهاتووە.. بەڵام ئەفسەرەكە، ئاگاداری كردنەوە، كـە شـتێكی وەهـا نەكـەن، هەواڵەكە بێجگەی ئەو پاسەوانە، كەسی تـر بیزانێـت، مـەبادا بكەوێـتە بـەر دەمـی ڕۆژنامـەكان و، بڵاویـبكەنەوە،

بـەوەش تاوانـبار وشـیاربێتەوەو، زیاتـر خـۆی دووربخاتـەوە، پۆلـیس نەتوانێت بیگرێت.

بـێوەژنە (لـیزا)ش بـە قسـەی ئەفسـەرەکەی کـرد، هـات تەنـیا بـە پاسـەوانی ژوورەکـەی (لوسـی)ی گـوت و، داوای لـێکرد، ڕاستی باسەکە بـۆ هەموو کەسێك باس نەکات، پاسەوانەکەش لەوە دڵنیای کردو، دوو نامـەی (لوسـیان)ی پـێدا، بـۆ ئـەوەی بـۆ (لوسـی)یان ببات، ئەویش بۆ (لوسی)ی هێنانەوە.

ئـێوارە بـێوەژنە (لـیزا) گەڕایـەوە لای (لوسـی)، کـە هێشـتا هـەر لـە مـاڵی ئەفسـەرەکە بـوو و، دوو نامەکـەی (لوسیان)ی پێدا.. (لوسی) بە ئـارەزوو و خۆشیەکی زۆرەوە خوێندنـیەوە، ئیـنجا هات نـامەیەکی بۆ (لوسـیان) نووسـی و، تـیایدا بـۆی ڕوونکـردەوە، کـە چۆن بە مردوویی بەجێهـێڵدراوە، بـەڵام خـوای گـەورە نەیکوشـتووەو، ڕزگـاری کـردووە، هـەروەها دڵنـیای کرد، کە تەندروستی زۆر باشەو، ئارەزوویەکی زۆری دیداری دەکات.

هەرچـی (جـاك جـیرۆد)ە، ئەوسـاتە دڵنیا بوو، لە کوژرانی (لوسی)!! (ئۆفـید)یـش هـەر لـەو کاتـە، نامەیـەکی بـۆ (ئـەماندا) نووسی، تیایدا وای دەرخسـت، کـە ناچـارە سـەفەر بکـات، هـەر لـەو نامەیـەیدا هـەزار فرەنکیشـی بـۆ (ئـەماندا) نـاردبوو، بـەڵام (ئـەماندا) زانـی، کـە ئـەو نامەیـە فرِوفێڵێکی (ئۆفـید)ە بـۆ ئـەوەی خـۆی لـێ بدزێـتەوە، بۆیـە حـەزی کرد، ڕاستییەتی ئەو (ئۆفید)ە تەمومژاوییەی بۆ ڕوونبێتەوە،

بەڵام (نۆفید) وای نەکردبوو، ڕێگەیەك بۆ ئەو مەبەستە لە پێش (ئەماندا) کراوە بێت.

کەچی دڵنیایی (بۆل هرمان) و (نۆفید) بە سەرکەوتنی تاوانەکەیان زۆری نەخایاند، چونکە وردە وردە (لوسی) چاك بوویەوەو، وای لێهات، بتوانێت بێتەوە بوار بۆ ئەنجامدانی کارەکانی، ئەوەندە بوو، دەبوو ئاگای لە خۆی بێت و، زۆر خۆی هیلاك نەکات، یەکەم کاریشی دوای ئەوەی گەڕایەوە پاریس، هاتە لای (ماری هرمان)، بۆ ئەوەی کراس و جلە نوێیەکانی بۆ بگرێت.. بۆیە کاتێك خزمەتکارەکە (ماری)ی ئاگادار کردەوە، کە (لوسی)ی بەرگدروو هاتووە، (جاك) ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا!! ترسێکی زۆری لێنیشت!! بیرە ڕەشەکان باڵیان بەسەر خەیاڵیدا گرتەوە!!

(ماری) ڕەتیکردەوە، پێشوازی لە (لوسی) بکات! بەڵام باوکی پێیگوت:

- (ئەو کچە کە لوسیانی خۆشدەوێت، مانای ئەوە نییە، خراپەی تۆی دەوێت، بۆیە پێویستە پێشوازیی لێ بکەیت، جا ئەگەر زۆریشت حەزکرد نەیبینی، ئەوا دەتوانی دواتر ئەو داوایە لە خاتوو ئۆگستین بکەیت، کە ئەو لەمەولا بەرگدرووێکی ترت بۆ ڕەوان بکات).

(ماری) بڕوای بەم قسانەی باوکی کردو، بە خزمەتکارەکەی گوت، لوسی بێنێتە ژوور، بەڵام کە چاوی پێی کەوت، بە لوتبەرزییەکەوە لێی پرسی:

- (چیت لە من دەوێت)؟

(لوسی) وەڵامی دایەوە:

- (بۆ ئەوە هاتووم، جلی نوێت بۆ بگرم وەك داوات کردبوو، داوای لێبووردنیش دەکەم، لە دواکەوتنم، چونکە دووچاری ڕووداوێك هاتم، چەند ڕۆژێك لە کارکردندا پەکی خستم).

- (بۆچی؟! چیت بەسەر هات)؟

- (کابرایەکی نەناسراو دامیە بەر چەقۆ و، کاتژمێر و ملوانکەکەشی دزیم).

- (باشە کابرا گیرا)؟

- (بەداخەوە نەخێر.. هەروەها لە بەر ئەوەی زۆر تاریك بوو، تەنانەت منیش نەمتوانی دەموچاوی ببینم)!

(جاك) کە ئەمەی بیست، پشووی هاتەوە، ئیتر لەوە دڵنیابوو، کە مەترسی لە ئاشکرابوونی ئەو کارەیان - کە لە دژی (لوسی) کردیان - نییە، چونکە ئەو نازانێ کێ لێی داوە.

ئینجا (جاك) لە دەموچاوی (لوسی) ورد بوودوەو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: (ئەو دەموچاوە لە من نامۆ نییە).. بەڵام نەیدەزانی لە کوێی دیوە، تا لە پڕێکدا چاوەکانی گەشبوونەوەو، لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئۆ هۆ وە.. ئەمە کت و مت حەننە فۆرتیەیە)!! ئیدی یەکسەر بەراوردی لە نێوان ناوی (لوسی) و، ناوی ئەو کچە کرد، کە (حەننە فۆرتیە) خستبوویە لای دایەن و، لەوێ ناویان نابوو (لوسی)!! هەروەها ئەوەشی بیر هاتەوە، کە ئەو کچە بێکەسەو، لە

خانەی مندالە بێ دایك و باوکەکان گەورە بووە، بەوەش بڕوای ئەستوور بوو، کە ئەو کچە هەمان کچەکەی (حەننە فۆرتیە)یە!!

هەرچی (ماری)یە، بە (لوسی)ی گوت:

- (من لەمەولا پێویستیم بە تۆ نییە).

بەوەش (لوسی) تێگەیشت، کە (ماری) نایەوێت جارێکی تر ئەو بچێت جلەکانی بۆ بگرێت و، بدوورێت، بۆیە یەکتاو ماڵئاوایی کردو، ماڵەکەیانی بەجێهێشت.

## ٢٧- (ئۆفید بە تاوانێکی تر ڕادەسپێردرێت):

بۆ ڕۆژی دواتر (جاك) هاتە ماڵی (ئۆفید) و، مەسەلەی (لوسی)ی بۆ باسکرد، ئەویش سەیری پێهات و، دڵنیابوو، کە خەنجەر لێدانەکەی کاری نەکردووە.

(جاك) گوتی: (لێدانەکە کاری نەکرد، قەی نا، بەڵام کارێکی ترت پێ ڕادەسپێرم).

- (من وەکو وادەم پێدای، هەمیشە لە خزمەتت دام).

- (من نیوەی سامانی خۆم دەدەم، ئەگەر بگەمە ئەنجامێك، لەوەی لوسیی بەرگدروو، لوسیی کچی حەننە فۆرتیەیە، کە لە ساڵانی ١٨٦١، ١٨٦٢ خستیە خان و، بە ژمارە نۆ ناودەبرا).

- (بەڵام باشە چۆن ئەو شتە سەیرەت بە مێشکدا هات)؟!

- (نەخێر ئەو بیرە نەك هەر سەیر نییە، بەڵكو زۆر لەجێشە.. چونكە من وەكو تێبینیم كردووە، ناو و تەمەن و وێكچوونەكەی بە حەننە، هەموو ئەوانە بۆ ئەوەم دەبەن، بڵێم: ئەو كچە كچەكەی حەننەیە)!

- (جا ئەوە دامانـنا بۆچوونەكەشت ڕاستە، بەڵام باشە چ سوودێك دەدات)؟!

- (چۆن چ سوودێك دەدات؟! ئەگەر ئەوە ئاشكرابوو و، لوسیان زانی لوسی كچی بكوژی باوكیەتی، ئەوكاتە واز لەو دێنێت و، كچەكەی من دەخوازێت)!

- (تۆ ڕاست دەكەیت، منیش وادە دەدەم، لە بەیانییەوە بە دوای ئەو كارەدا دەڕۆم).

- (كەوابێت دەبێ بچیتە گوندی جوانی، لەوێ لە بارەی ئەو كچە بچوكەی حەننە بپرسی.. باشە؟! بێگومان پارەشت دەوێت)؟!

- (ئەی چۆن!! خۆت نازانی ...)!

ئیتر (جاك) بڕە پارەیەكی زۆری پێدا، هیوای سەركەوتنی بۆ خواست و، بەجێی هێشت.

هەرچی (ماری)یە، دوای ئەوەی (لوسی) بەجێی هێشت و، باوكیشی چووە كارگە، هەستی بە بێتاقەتی كرد، وای بە بیردا هات، بچێتە ماڵی (ئیتیان)ی وێنەكێش، كە وەصیی (جۆرج)ە، كاتێك گەیشتە لای، (ئیتیان) پێی گوت: (بێگومان بۆ ئەوە هاتوویت، گلەییم لێ بكەیت، كە ئاخۆ بۆچی وێنەكانی تۆم تەواو نەكردووە)؟

ـ (نا.. بەلام شتێکی ترت لێ داوا دەکەم، ئەویش ئەوەیە، یادی لە دایك بوونی باوکم دوای دوو مانگی دیکەیە، منیش دەمەوێت لەو ڕۆژە دیارییەکی پێشکەش بکەم).

ـ (تێگەیشتم، دەتەوێت وێنەیەکی خۆتی پێشکەش بکەیت)؟!

ـ (بەڵێ وایە، جا تکا دەکەم بۆ ئەو کاتە ئامادەبێت).

ـ (منیش ئومێدم ئەوەیە، بەلام دەتەوێت وەکو ئەو وێنەیەی گەورە بکەم)؟

(ئاماژەی بۆ وێنەیەکی گەورەی گۆشەیەکی ماڵەکە کرد، کە وێنەی حەننە بوو، لەو دەمەی پۆلیس دەیگرت).

(ماری) گوتی: (وای لەو لێکچوونە گەورەیە!! من کچێکی گەنج دەناسم، ناوی لوسییە، ڕێك دەڵێی ئەو ژنەیە، کە پۆلیس دەوریان داوە)!

ـ (باشە ئەو کچە لە کوێ دەژیت)؟!

ـ (لە شەقامی بۆربۆن، ژمارە: ٩).

(ئیتیان) لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئەو کچەش کە لوسیان لابرۆ دەیەوێت بیخوازێت، ئەویش ناوی لوسییەو، لە شەقامی بۆربۆن، ژمارە نۆ دادەنیشێت، ئەویش زۆر بە حەننە فۆرتیە دەچێت و، ئێستاکەش تەمەنی بیست و دووساڵە)!

ئینجا لەگەڵ (ماری) لەسەر قەوارەی وێنەکە ڕێککەوتن و، داوای لێکرد دانیشێت پێکەوە ساردییەك بخۆنەوە.

دانیشتن و، کەوتنە قسان.. (ماری) لاوێتی باوکی و، سەفەرەکەی بۆ ئەمریکاو، سەربردەکەی لەگەڵ (جیمس مۆرتیمەر) و کچەکەی و، هەموو ئەوانەی بۆ (ئیتیان) باسکرد، دوای ئەوە (ئیتیان) لێی پرسی: (ئایا باوکت پێشنیارە کۆنەکەی تۆی لە بارەی لوسیان لابرۆ قەبوڵکرد)؟

(ماری) بە بیستنی ئەم پرسیارە لە داخان سوورهەڵگەڕاو، وەڵامی دایەوە: (باوکم پێشنیارەکەی منی پێ گەیاندووە، جا نومێدەوارم لە بارەیەوەی بگەنە یەك)!

(ئیتیان) بۆی دەرکەوت، لە بارەی (لوسیان)ەوە، چ لە مێشکی (ماری)دا دەخولێتەوە.

٢٨- (لێکۆڵینەوە لە مەسەلەی لوسی):

بۆ ڕۆژی دووەم (ئۆفید) چووە گوندی (جوانی) و، لە هوتێلێك شوێنی بۆ مانەوەی خۆی گرت، دوای ئەوە گەڕا، تا ژنە دایەنێکی بەساڵاچووی دۆزیەوەو، پرسیاری کچەکەی (حەننە فۆرتیە)ی لێکرد.. ئەویش گوتی: (پێدەچێت ئەو کچە لای فریمی دایەن بەخێوکرابێت، بێگومان ئەویش کە کاری خۆی لە پێگەیاندنی ئەو کچە تەواوکردووە، بە کوێخای ئەو گوندەی سپاردووە، کە ئەو تۆماری ناوی هەموو ئەو منداڵانەی لایە، کە لە دایەنگای ئەو گوندە بەخێو کراون).

(نۆڤـیـد) سوپاسـی ئـەو پیرەژنـەی کردو، ڕۆیشت، بەڵام ترسا لەوەی یەکاویـەك بچـێتە لای کوێخـا، مـەبادا ئـەو لـێی بپرسـێت: (تـۆ چ پەیوەندییەکت بـە حەنـنە فۆرتـیە هەیـە)؟؟ یانیش نەوەکو گومانی پێبـبات! لەبـەر ئـەوە هـات لـە ڕێگـەی خـۆی چـووە یـەك لـە نووسـینگەکان، لـەوێ لـە یـەك لـە خـزمەتگوزارەکانی پرسـی: (ئایـا دەزانی ساڵی ١٨٦١ کێ کوێخای ئەم گوندە بوو)؟!

خـزمەتگوزارەکە لە وەڵامیدا گوتی: (کوێخای ئەوساکە دۆشمان بوو، کە ئێستا چاوەکانی کوێربوونەو، ئەوەتا لە دیجۆن نیشتەجێیە).

- (باشە ڕێگە دەدەی پرسیارێکی ترت لێ بکەم)؟

لـێرەدا کەسـێکی تـر هاتـە قوتابخانەکـەو، کەوتـە هەرەشـەکردن لـە کابـرای خـزمەتگوزارو، بـە درۆزنـی و ساختەچیەتی تاوانـباری کـرد، خـزمەتگوزارەکەش بـە لاوازیـیەوە پـێی گـوت: (تکـا دەکـەم: بـەس هەفتەیەکی تریش لەسەرم بووەستە)!

پـیاوەکە بەمـە ڕازی نـەبوو و، بـە دڵڕەقـیـیەوە پـێی گـوت: (نەخێر تـەنها یـەك ڕۆژت لەسـەر دەوەسـتم، ئەگـەر بێت و بەیانی ئەو هەزار فـرەنکەم پـێ نەدەیـتەوە، کـە بـە دوو سـەنەدی سـاختە لێمـت قەرزکردووە، ئەوا دەتدەمە دەست پۆلیس).

ئـیتر پـیاوەکە ڕۆیشـت و، خـزمەتگوزارەکەش بـە دەستەوسـانییەوە پەنای بۆ گریان برد، بە (نۆڤید)ی گوت:

- (گەوردم.. مـن شایسـتەی ئـەو عەزابـەم.. ئەو پیاوەی دیتت، ئەوە هاوپشـکی مامـە لـە ئـیش و کار، من پێویستیم بە پارە بوو، بۆیە بە

ناوی مامم دوو سەنەدی ساختەم دروستکردووە، چووم هەزار فرەنکم لەو پیاوە وەرگرت، بەڵام کە کاتی گەڕاندنەوەی هات، ترسام مامم پێی بزانێت، بۆیە گەڕامەوە لای ئەو پیاوەو، دانم بەوە نا، کە ئەو سەنەدانە من بە ساختە دروستم کردووون و، مامم ئاگای لێیان نییە، ئەویش بەزەیی پێمدا هاتەوەو، دەرفەتێکی ترو، دەرفەتێکی سێیەمی پێدام، کەچی تا ئێستا من هەر نەمتوانی پارەکەی بۆ ببەمەوە، بۆیە ئەوەتا ئەویش ئارامی نەماو، ئێستاکە ئاوام لێ توند دەکات.. لەوەش سەیرتر!! من هەموو ئەوەم لە پێناوی ژنێك کرد، کەچی کە زانی سەنەدی ساختەم دروستکردووەو، پارەم پێ پەیدا کردووە، دەنا خۆم خاوەنی هیچ نیم، لێم پەشیمان بووەوەو، شووی پێ نەکردم)!

(ئۆفید) وای پیشاندا، کە زۆری بۆ پەرۆشەو بەزەیی پێدادێتەوە، پێی گوت: (ئەدی ئێستا بە تەمای چی بکەیت)؟

- (جا چی بکەم؟ یان دەبێ خۆم بکوژم، یانیش دەبێ چاوەڕێی ئەوە بکەم پۆلیس بێن بمگرن، چونکە مامم بەو ساختەیییەی من بزانێت، بە هیچ شێوەیەك لێم خۆش نابێت)!

(ئۆفید) بە هەڵی زانی و، گوتی: (بڕۆ لەگەڵت دێمە لای ئەو هاوبەشەی مامەت و، هەزار فرەنکەکەت بۆ دەدەم).

کابرای خزمەتگوزار سەرەتا بڕوای نەهات!! بەڵام (ئۆفید) دڵنیای کردەوە، کە ئەو سوورە لەسەر قسەی خۆی، بۆیە بە گەڵی کەوت، چوونە لای کابراکە، (ئۆفید) پارەکەی پێداو، دوو سەنەدەکانی لێوەرگرتەوەو، خستنیە گیرفانی.

دوای ئـەوەی مـاڵی کابـرای خـاوەن قـەرزیان جێهێشـت، کابـرای خـزمەتگوزار بـە (ئۆفـید)ی گوت: (تۆ ژیان و ئابڕووی منت کڕیەوە!! باشە بە چی چاکەی تۆ بدەمەوە)؟!

(ئۆفید) گوتی: (دوایی پێت دەڵێم، چۆن چاکەکەم بدەوە).

ئـیتر بـەرەو هوتـێل هاتـنەوە، لـە دەرەنجـامی قسـەکردن لەگـەڵ یـەکتریدا، (ئۆفـید) بـۆی دەرکـەوت، کـە ئـەو خـزمەتگوزارە ئێستاش هەزار فرەنکی یەکێکی تر قەرزارە، بۆیە پێی گوت: (من ئەویشت بۆ دەدەمەوە، ئەگەر تۆ بە قسەم بکەیت)؟!

کابرای خزمەتگوزار گوتی: (فەرمان بکە گەورەم.. فەرمان بکەو لە قسەت دەرناچم)!

(ئۆفـید) گوتـی: (کەوابێت ئێستا پێت دەڵێم: بەر لە بیست و دوو ساڵ بـە یـەکێ لە هۆکان، کچێکم لای ژنێك دانابوو، ئەویش لە ماوەی ونـبوونی مـن، کچـەکەی لای یـەك لـە ژنـە دایەنـەکانی ئـەو گوندە بە نـاوی فـریمی جێهێشـتوە، پـاش ئـەویش دیـارە وەکـو زانـیومە ڕەوانـی خانـەی پـێگەیاندنی مـنداڵە بێ کەسەکان کراوە، بۆیە من داوام لە تۆ ئەوەیـە، بـۆ مـن بچـیتە لای کوێخـای ئـەو گونـدە، وێـنەیەك لـە ژیانـنامەی ئـەو کچـەم، کـە لـە نێو تۆماری کوێخایە بۆ کۆپی بکەیت، چونکە بێگومان لەو تۆمارەی لای ئەو زانیاری زۆر لەسەر ئەو کچەم هەیە).

- (گەورەم تۆ داوای شتێکی زۆر ترسناك دەکەیت، بەڵام لە قسەت دەرناچم، بەس پێم بڵێ: لە ساڵی چەندەوە ئەو کچە خراوەتە خانەی ناوبراو)؟!

- (لە ساڵی ١٨٦٠ یان ١٨٦١).

- (ئەدی ناوی ئەو ژنەی لەوێی داناوە چییە)؟!

- (حەننە فۆرتیە).

کابرای خزمەتکار مووچڕکی بە گیاندا هات و، گوتی:

- (بەڵام ئەو ژنە تاوانبارێکی ترسناکە)!

- (نەخێر ئەو بێ تاوانە، منیش دڵنیام تۆ بڕوام پێ دەکەی، کە دەڵێم بێ تاوانەو، هەروەها دڵنیام لەوەش، کە یارمەتیم دەدەیت، بۆ دۆزینەوەی کچەکەم).

- (باشە! هەر ئێستا داواکەت بەجێ دێنم).

- (کەوابێت چاوەڕێت دەکەم، تا ئەو بەڵگەنامەیەم بۆ دێنیت، بەڵام تکا دەکەم، جارێکی تر حەز لە چ کچێکی تر نەکەیت)!

- (گەورەم.. خوا ژنان لە ناو بات، ئاخەر ئەو (ئەماندا)یەی بۆ من بووە مایەی ئەو هەموو سەرئێشەیە، لە جوانیدا یەکەم بوو).

- (ئەماندا)؟!

- (بەڵێ.. چییە دەیناسی)؟!

- (نازانم ئەوەیە کە تۆ دەیڵێی، یان نا، بەڵام کچێك دەناسم بەو ناوە، بەس لێرە نییە).

ـ (جا ئـەوەی منـیش دەڵـێم، ئێسـتا لـێرە نـەماوە، چـۆتە پـاریس، ئەمـەش دوای ئـەوەی شـتەکانی ئـەو کۆگایـەی دزی، کـە کـاری تـیا دەکـرد، خـاوەنی کارگەکـە ویسـتی لای پۆلـیس شـکاتی لێ بکات، بەڵام ئەماندا تکـای لـێکرد، ئـەوەی لەگـەڵ نـەکات، ئـەو دوای ساڵێك نرخی هـەموو ئـەو شـتانەی بـۆ دەگێڕێـتەوە، کـە لـێی دزیـوە، بۆیـە منـیش ناچـار بـووم ئـەو سـەنەدە سـاختانەی بـۆ بکەم، تا ئەو لەو بارە ڕزگار بکەم)!

ـ (باشە ئەو کۆگایەی ئەماندا دزی لێکرد، لە کوێیە)؟

ـ (لە شەقامە گەورەکە، ژمارە حەفتاو چوارە).

دوای ئــەوە لـێك جـیابوونەوە، بـۆ ئـەوەی بـۆ ڕۆژی دووەم یـەکتر ببیننەوە.

هـەر ئـەو خـزمەتگوزارە لای کوێخای گوندەکەش خزمەتگوزار بوو، بۆیـە چـوو بە ئاسانی تۆمارەکەی کردەوەو، ئەو لاپەڕەیەی لێکردەوە، کـە (ئۆفـید) مەبەسـتی بـوو و، ژیانـنامەی (لوسـی) تیابوو، نەك بێت دانەیـەکی لەبـەر بگرێـتەوە، دوای ئـەوە کاغەزەکـەی خستە بەرکی و، چوو بە لای ئیشی خۆی.

## ٢٩ـ (تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکان):

(ئۆفــید) هاتــە ئــەو دوکانــەی (ئــەماندا) دزی لــێکردبوو و، بــە خاوەنەکـەی گـوت: (مـن دەمەوێـت بـاربووی هـەموو ئـەو ماڵـەت بـۆ

بکەمــەوە، کـە لێـت دزراوە، بـەڵام بـەو مەرجـەی ئـەو نامەیـەم پـێ بدەیـت، کـە تـیایدا ئـەماندا دانـی ناوە، کە ئەو دزیەکەی لێکردوویت، جا ئەگـەر ئـەوەت بـۆ کـردم، ئـەوا منـیش پـاش یـەك ساڵی تـەواو لە ئێستا هەموو زیانەکەت بۆ دەگێڕمەوە).

خـاتوونی خـاوەن دوکـان ڕازی بـوو، نامەکـەی (ئـەماندا)ی دایـە (ئۆفـید)و، دڵـی خۆشـبوو، کە دوای ساڵێکی تر پارەی زیانەکانی خۆی وەردەگرێتەوە.

خـزمەتکارەکەش بـۆ ئـێوارە ئـەو کاغـەزەی لـە کوێخـای گوندەکـەی دزیـبوو، هێنای دایە (ئۆفید)، لەو کاغەزەدا (فریمی) دایەنی (لوسی) نووسیبووی: (مـن لوسـیی کچـی حەنـنە فۆرتـیەم لـە مـانگی نیسـانی ١٨٦٢ دایـە کوێخـای گونـد، بـۆ ئـەوەی بـیخاتە خانـەی بەخـێوکردنی منداڵە بێکەسەکان).

(ئۆفـــید) بـــەو بەڵگەنامەیـــە یـــەکجار دڵخۆشـــبوو، هەرچـــی خزمەتکارەکەشـە پـێی گـوت: (گـەورەم ئیـنجا ئـەو دوو سـەنەدانەم دەدەیتەوە، کە نرخەکانیم پێدای)؟!

(ئۆفید) وەڵامی دایەوە: (مەترسە کوڕی خۆم.. سووتاندوومن).

دوو کاتژمـێر دوای ئـەوە (ئۆفـید) گەڕایـەوە پـاریس و، دڵنـیابوو لـەوەی، کـە لـە کارەکـەیدا سـەرکەوتنی بە دەست هێناوە، بەوەش زۆر دڵخۆشـبوو، کـە ئـەم نامەیەی (ئەماندا)ی دەستخستبوو، چونکە بەمە دەسـتی (ئـەماندا) دەکەوتـە ژێـر سـەری و، دەیـزانی بـۆ ئایـندە بـەم هۆیەوە، کاری زۆری پێدەکات!

با (ئۆفید) جێبێلین و، بگەڕێینەوە لای ئەو ئەفسەرەی لە هەوڵی کوشتنی (لوسی) دەکۆڵێتەوە، پۆلیسەکان بەرگی ئەو خەنجەرەیان دۆزیەوە، کە تاوانبار بە کاری هێنابوو، لەسەری نووسرابوو: (ڕووشار.. فرۆشیاری چەك.. شەقامی بۆربۆن، ژمارە نۆ).

هەروەها ئەفسەرەکە تێبینی ئەوەشی کرد، کە ئەو ناونیشانە هەمان ناونیشانی ماڵی (لوسی)شە، بۆیە بۆی دەرکەوت، کە تاوانەکە لە دەرەنجامی پیلانێکی پێشوەخت و، مەبەستدارەوەیە.. بۆیە هاتە ئەو کۆگایەی چەك فرۆشتنەو، خاوەنی کۆگا بۆ دەفتەری چەکە فرۆشراوەکانی گەڕایەوە، گوتی: (من ئەو خەنجەرەم ڕۆژێك پێش ڕوودانی ئەو تاوانە فرۆشتووە).. هەروەها گوتی: (ئەوەی لێشمی کڕی، پیاوێکی پیری تەمەن لە سەرووی پەنجا ساڵی بوو، لەش و لارێکی قیت و قۆزی هەبوو).

دوای ئەوە ئەفسەرەکە لەگەڵ دادوەری لێکۆڵینەوە سەرکەوتن بۆ ژوورەکەی (لوسی) و، هەواڵیان پێدا، کە ئێمە لەو بڕوایەین: (ئەو تاوانەت لە دەرهەقدا بە مەبەست ئەنجامدراوە، نەك هەر بە ڕێکەوت ئەوەت بەسەردا هاتبێت).. بەڵام (لوسی) ئەوەی بە دوور زانی و، گوتی: (من کچێکی هەتیو بوومە، بڕوا ناکەم کەسێك دژایەتی لەگەڵمدا هەبێت)!

دوای ئەوە ئەفسەرو دادوەرەکە ڕۆشتن و، (لوسی)ش هاتە کارگە لای خاتوو (ئۆگستین)، (ئەماندا)ش لەوێ بوو، (لوسی) هەموو ئەنجامەکانی لێکۆلینەوەکانی پێ گوتن.

### ٣٠- (بارۆن ئەرنۆڵد):

دوای گەڕانەوەی (ئۆفید) یان ئەوەی لە لای (ئەماندا) بە (بارۆن ئەرنۆڵد) ناسرابوو، ، چاوی بە (ئەماندا) کەوت و، (ئەماندا) گلەیی ئەوەی لێکرد، کە ماوەیەکە هەواڵی پچڕاوە.. دوای ئەوە (ئۆفید) لە بارەی (لوسی) بەرگدرووەوە پرسیاری لە (ئەماندا) کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە:

- (ئەفسەر و دادوەری لێکۆڵینەوەش لەو بڕوایەدان، کە لەو مەسەلەیەدا تاوانێکی نەخشەبۆکێشراو هەیە، ئەویش لەبەر ئەوەی ئەوان دەریانخستووە، کە تاوانبارەکە، کە پیاوێکی تەمەن پەنجا ساڵەیە، لە کۆگایەکی چەك فرۆشیی نزیك ماڵی لوسی ئەو خەنجەرەی کڕیوە).

لێرەدا ڕەنگی (ئۆفید) گۆڕاو، تێکچوو، (ئەماندا) لێی پرسی:

- (چیت لێ هات؟! هەست بە ئازارێك دەکەیت)؟!

(ئۆفید) دانی بە خۆیدا گرت و، گوتی:

- (نا.. هیچم نییە).

(ئەماندا) گوتی: (بێگومان تۆ ئەو پیاوەت دیوە، کە چۆتە کۆگاکەو خەنجەرەکەی کڕیوە، چونکە ئەمە لەو کاتەدا بووە، کە من لای لوسی بووم و، تۆش لە نێو ئۆتۆمبێلەکەت لە دەرەوە چاوەڕوانیت دەکردم).

(ئۆفـيد) بـه بێزاريـيەوه: (لـەو كاتـەدا مـن زەيـنم لەسـەر كۆگاكـه نەبوو).

ئينجا (ئۆفـيد) هەوڵی دا، باسـەكه بگۆڕێـت، گوتـی: (لەو سەفەرەی دووايیمدا باسـی فرۆفـێلاوی زۆرم كۆكـردۆتەوه، چونكه ئەوه هەر له كۆنەوه ئارەزووی منه).

- (يانی هی ناودارانيش كۆدەكەيتەوه)؟

- (بـەڵكو مـن هـی ئەوانـه كۆدەكەمـەوه، كـه له ژياندا موغاميرن، بۆ ئـەوەی لـێی بكۆڵمـەوەو، تايبەتمەنديـيەكانی شيبكەمەوه).. ئينجا به مۆنيـيەكەوه سەيری كردو، گوتی: (بۆ نمونه: كاغەزێكم لايه به ناوی بۆل دۆشمان، كه ئەوه پياوێكی ناودار نييه).

- (ئەو پياوه كێيه)؟

- (ئەوه لاوێكه، يارمەتی دەربازبوونيم دا له بەنديخانه، ئێستاكه له گوندی جوانی دادەنيشێت، تۆ ئەو گونده پێدەزانی)؟

- (نەخێر).

- (تۆ دڵنيايت لەوەی دەيڵێيت)؟

بـه هـەوڵدان بـۆ ئـەوەی تـرس و لەرزەكـەی بشـارێتەوه، وەڵامـی دايەوه: (بێگومان).

- (بەڵام مـن لـه قسەكەی تـۆ دڵنيا نيم.. چونكه منيش فرۆفێلێكی تـرم لەبـەر دەستدايه، لـه خـاتو دلـيۆزی بـەرگدرووم وەرگـرتووه، كه ئـەوەش وەكـو دانپيانانـێكه لەلايـەن ئـەماندا ڕجـامی، واتـه: تـۆ.. بـه ئەنجامدانی دزی).

(ئەماندا) نەیتوانی لەو ڕاستییە هەڵبێت، بۆیە گوتی:

- (ئەمە لە هەڵەکانی ڕۆژانی بێ سەرووبەریم بوو، بەڵام چیت لەو کاغەزە کرد)؟!

- (مەترسە ئازیزەکەم.. لای خۆمم پاراستووە).

- (بۆمی ناگەڕێنیەوە)؟

- (تۆ دەزانی من حەزم لە کۆکردنەوەی نامەی خەڵکان هەیە، بۆیە لای خۆمی دەپارێزم، بەڵام مەترسە، من تۆم خۆش دەوێت و، قەت ئازارت نادەم).

دوای ئەوەی لێکجیابوونەوە، (ئەماندا) لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئەم پیاوە تەماوییە.. نایەوێت شوێنی تیا دانیشتنی خۆیم پێ بڵێت.. منیش گومانی ئەوەی لێدەکەم، کە لە کاتێکدا من لای لوسی بووم، هەر ئەوە خۆی خەنجەرەکەی کڕیبێت.. دواتر ئەو وەسفانەی تاوانبار، کە ئەفسەرەکە بۆ (لوسی)ی کرد، لە وەسفی ئەوە نزیکە).

(ئۆفید)یش بیری لە (ئەماندا) دەکردەوەو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: (بێگومان وا خەریکە گومانم لێ پەیدا دەکات.. لەو بڕوایەدام تۆڵەشم لێدەکاتەوە.. بەڵام هیچ نییە، چونکە ئەویش لە ئابڕووی خۆی دەترسێت، مەبادا من ئەو کاغەزەی بڵاوبکەمەوە، کە ئەو ئیمزای لەسەر کردووەو، بەوە ئابڕووی دەچێت).

## ٣١ـ (گەڕانەوەی لوسیان):

(جـاك) چـاوەڕوانی ئـەنجامی لێکۆلیـنەوەکانی (نۆفـید)ی لـەبارەی (لوسـی)یـەوە دەکـرد، کاتـێك (نۆفـید) ئەنجامەکـەی پـێڕاگەیاندو، بەلگەنامەکەی پـێدا، ئەوەشی پـێگوت، کە ئـەو لـە بـارەی (لوسی) لە بەڕێوەبـەری خانەکـەی پرسـیوە، ئـیتر گومـانی نـەماوە، کـە هـەمان (لوسـی)یـە بەرگدرووەکەیـە، (جـاك) لـە دڵـی خۆیـدا گوتـی: (دە کەوابێت: با بزانین؟ ئایا لوسیان لابرۆ ئێستاش سوورە لەسەر هێنانی کچێك، کە دایکی ئەو کچە بکوژی باوکییەتی؟ یان نا)؟!

هەرچـی (ماری)شە، غەمگین بوو بە جیابوونەوەی (لوسیان)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا دڵـی خـۆی بـەوە دەدایەوە، کە دەشێ پاش دوو ڕۆژی تر بگەڕێتەوە.

کاتـێك (لوسـیان) گەڕایـەوە، دەزگیرانەکـەی هـەموو ئـەوەی بـۆ گـێڕایەوە، کـە بەسەری هات و، پێی گوت، کە ئێستاکە باشم.. بەمەش (لوسیان) لـە سـەلامەتی ئازیـزەکەی دڵنـیابوو، چونکە پێشتر بە هۆی ئـەو نامەیـەی بـۆی ناردبوو، نـیگەران بـبوو، لـەوەی خـوا نەخواسـتە شـتێکی لێبـێت.. ئینجا هەردووکیان و، (لیزا)ی بێوەژنیش هەڵسانەوە چوون نانی شێوانیان خواردو، تا درەنگ پێکەوە دانیشتن.

بـۆ ڕۆژی دووەم (لوسـیان) چـووە کارگـە، لـەوێدا چـاوی بـە (بـۆل هـرمان) کـەوت، باسـی هـەندێ کاروبـاری تایـبەت بـە کارگـەیان کـرد، بـەڵام (لوسـیان) سـەیری پـێهات، کـە (بـۆل هرمان) باسی کچەکەی بۆ نەکـرد، بۆیـە ئـەم پرسـیاری لـێکرد: (بەڕێـز.. ئـەدی خـاتو مـاری چۆنە)؟

- (نەخۆشە.. منیش دڵنیام، ئەو پێویستی بەو ئاسوودەییەیە، کە نەخۆشییەکەی لە بیر بباتەوە).

ئینجا (بۆل) بۆ نانی ئێوارە (لوسیان)ی دەعوەت کرد، هەرچەندە (لوسیان) پێی خۆشنەبوو و، دەیویست خۆی بدزێتەوە، بەڵام دواتر ڕازی بوو، چونکە لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئەگەر لە ماری ڕابکەم، ئەوە دەبمە هۆی ئازارو مردنی)!

کاتژمێر حەوت (لوسیان) هاتە ماڵی (بۆل هرمان)، (ماری) بە لاوازییەوە پێشوازی لێکرد، بەڵام لە پێش (لوسیان) بە باوکی گوت: (لوسیان دەزانێ خۆشەویستییەکەم لە بۆی، وام لێدەکات بەسەر نەخۆشییەکەمدا زاڵ بم)!

(لوسیان) گوتی: (منیش بە بینینت دڵشادم خاتوون).

- (ئومێدەوارم وا بێت.. داواشت لێدەکەم، دڵنیام باوکیشم ڕازی دەبێت، کە هەموو ئێوارەیەك بێیت لێرە نان بخۆیت).

(لوسیان) شڵەژاو، بیری کردەوە ئەم داوایە ڕەتبکاتەوە، بەڵام سووربوو لەسەر تەندروستی ئەو کچە هەژارە، بۆیە لەسەر پێشنیارەکەی ڕازی بوو و، گوتی: (ئەم دەعوەتەی تۆ بۆ من شەرەفێکی گەورەیە.. بەڵام تکات لێدەکەم، ڕێگەم بدەیت بەڵکو لە هاوڕێکانی تریشم نەپچڕێم، چونکە ئەوانیش مافیان بەسەرمەوەیە).

(بۆل هرمان) بە کچەکەی گوت: (کچی خۆم.. لوسیان ڕاست دەکات، ئێمەش هەقی ئەوەمان نییە، هەموو کاتەکەی بۆ خۆمان داگیر بکەین).

هەمووان پێکەنین، کاتژمێر دە (لوسیان) بە سوپاسەوە هاتە دەر، بەلام لە دڵی خۆیدا دەیگوت: (دەبوو ئەوە بۆ ماری ڕوون بکەمەوە، کە من لوسیم خۆشدەوێت).

دوای ڕۆیشتنی (لوسیان)، (بۆل) لەگەڵ کچەکەی خۆی مایەوەو، پێی گوت: (ئێستا دڵنیا بوویت، کە تۆی خۆشدەوێت)؟

ـ (نەخێر باوکە.. تۆ هەڵەیت.. ئەو بەهانەی ئەوەیە، دەیەوێت سەردانی هاوڕێکانی بکات، بەلام سەردانی خۆشەویستەکەی دەکات.. (لوسی).. من ئیرەیی پێدەبەم، لەوانەشە ئەو ئیرەییەم پێی، وام لێبکات بیکوژم).

ـ (کچی خۆم دڵنیابە.. مادام من زیندووم، لوسیان بۆ تۆیەو، نایەڵم بۆ چ کچێکی تر بێت).

دوای ئەوە (بۆل) گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی، بە قوڵی بیری لەو مەسەلەیە کردەوە، سەرەنجام بڕیاری دا، بەیانی قسە لەگەڵ (لوسیان) بکات.. کاتێکیش بەیانی قسەی لەگەڵ کرد، پێی گوت: (جگە لە شووکردن، هیچ دەرمانێك بە کەڵکی کچەکەم نایێت.. جا ئایا پێی ڕازی دەبیت)؟

ـ (بەلام گەورەم...)

- (گوێ بگره لوسیان.. کچەکەم بە بارێکی ترسناکدا تێدەپەڕێت و، منیش وام لێهاتووە لەو ڕووەوە نەبێت بیر ناکەمەوە، دواتر ئەو کچەی تۆ خۆشت دەوێت، شایەنی تۆ نییە...)

- (تکایە قسەی وا مەکە.. چییە؟! سۆزی باوکایەتی کوێری کردوویت)؟!

- (نەخێر.. کوڕی خۆم.. بەڵام من دەمەوێت دوورت بخەمەوە لە هێنانی کچێك، کە ئەو کچە کچی حەننە فۆرتیەی بکوژی باوکتە)!

(لوسیان) هاواری کرد: (بەسیە درۆ..)

بەڵام (بۆل) ئەو کاغەزەی پێدا، کە (نۆفید) بۆی پەیدا کردبوو، هەرهێندە (لوسیان) خوێندییەوە، ئیتر لە هۆش خۆی چوو و، بە زەویدا کەوت.

## ٣٢- (دڵەکان نافرۆشرێن):

لە کاتێکدا (بۆل) ڕاستییەتی (لوسی)ی بۆ (لوسیان) ڕووندەکردەوە، (ماری) بەرەو ماڵی (لوسی) دەچوو.. کاتێك گەیشتەجێ، بە لوتبەرزییەوە پێی گوت: (پێت گوتوم: من هەتیو و هەژارم و، هیچ سەرمایەکم نییە، جگە لەوەی بە بەرگدرووێتی دەستی دەخەم)؟

- (ڕاستە.. بەڵام سوپاس بۆ خوا ئاسوودەم)!

- (ده كەوابێت درۆ مەكە.. من هاتووم ناسوودەییت پێ بدەم، دەمەوێت رێككەوتنێكت لەگەڵدا بكەم، ئەویش بەم شێوەیە: من سێ سەد هەزار فرەنكت پێ دەدەم، بەڵام بەو مەرجەی تۆ فرەنسا جێ بهێڵی).

- (بەڵام لەبەرچی فرەنسا جێ بهێڵم)؟!

- (چونكە دەمەوێت، خۆم بە ئارامی بژیم.. ئەو ئارامییەی كە تۆ لێت بردووم، ئەگەریش پارەكەت پێ كەمە، دوو ئەوەندەت پێ دەدەم.. هەموو ئەوەش بۆ ئەوەی واز لە لوسیان بهێنیت، ئەو لوسیانەی من خۆشم دەوێت و، نامەوێت بێجگەی من كەسی تر بهێنێت).

- (جا وا گومان دەبەیت، من بەو داوایەی تۆ ڕازی بم)؟

- (من دڵنیام ڕازی دەبیت).

- (كەوابێ بزانە: دڵەكان بە هەموو پارەی سەر پشتی زەویش ناكڕدرێن).

لێرەدا (ماری) لە چۆكی خۆی داو، لە (لوسی) پاڕایەوە بەزەیی پێدا بێتەوە، (لوسی) پێی گوت: (من زۆر غەمگینم بۆ ئەو بارە ناخۆشەی تۆ تێیدایت، بەڵام دڵەكان لە هەموو پارەی دنیا بەنرخترن).

(ماری) هەڵسایەوەو، بە دەنگێكی بەرزەوە گوتی: (دەنا تۆڵەم دەسەنمەوە..)، ئینجا وەكو شێتان ڕۆیشت و، (لوسی) كە تەنیا بەجێ ما، لە پێشەخۆیدا گوتی: (خوایە گیان بیبەخشە.. ئەو نەخۆش و هەژارە).

دوای ئەوە (حەننە) هاتە ژوورو، (لوسی) ئەوەی بۆ گێڕایەوە، کە ڕوویدا.

لێرەدا با بگەڕێینەوە لای (لوسیان):

(لوسیان) کاتێك هاتەوەخۆ، هاتە ژووری نووسینگەی (بۆل) و، پێی گوت:

- (بڕوام هات، کە لوسی کچی حەننەیە، بەلام هیچ بەلگەیەکی ڕوون نییە، بلێ: تاوانباری ڕاستەقینە حەننەیە)!

- (بەلام خەلکان وا بۆ لوسی دەڕوانن، کە کچی بکوژی باوکتە)!

(لوسیان) هەناسەیەکی قوولی هەلکێشاو، گوتی: (خوایە گیان.. لە چ سەرئێشەیەك کەوتم)!

(بۆل) هەولی دا، هانی بدات، بۆ ئەوەی کچەکەی ئەو بخوازێت و، گوتی: (ڕۆلە لە ڕەحمی خوا بێ ئومێد مەبە، یان لە بیرت چوو، ئەوەتا کچێکی جوانی تر ئامادەیە شووت پێ بکات؟! تا ئەوپەڕی خۆشتی دەوێت و، زۆریش دەولەمەندە! دواتریش بڕوا بکە، ئەگەر ئەو کچەی من ڕەتبکەیتەوە، دەمرێت)!

(لوسیان) کەمێك بێدەنگ بوو، ئینجا گوتی: (هەوالی ئەم ڕاستییەی لوسی بە کچەکەت بدە، بۆ ئەوەی دلنیابێت، تازە من ئەو کچە ناهێنم، جگە لەوەش بیر لەو مەسەلەی ژنهێنانەی خۆم دەکەمەوەو، بڕیارێکی گونجاوی لە بارەوە وەردەگرم).

دوای ئـــەوە (لوســـیان) بـــە چـــاوی بـــە فرمێســـکەوە بـــەرەو ئـــەو نانەواخانەیـە هـات، کـە (حەنـنە فۆرتـیە) تـیایدا کاری دەکرد، کاتێك (حەننە) بەم شێوەیەی دیت، ترساو، لێی پرسی:

ـ (ئەو فرمێسکانەی تۆ وا پێدەچێت، شتێکی ترسناك هەبێت).

پـاش ئـەوە دانیشـتن، (حەنـنە) هـەواڵی ئـەوەی پـێدا، کـە (مـاری) هاتۆتـە مـاڵی (لوسی) و، بۆی گێڕایەوە، کە چۆن ئەو هەموو پارەیەی پـێداوە، هـەر بـۆ ئـەوەی (لوسی) ئەو وڵاتە جێبێڵێت، تا ڕێگە بۆ ئەو خۆشـبێت شـوو بـە تـۆ بکـات، بـەڵام لوسـی ڕەتی کردۆتەوە بە هەموو مـاڵی دنـیاش ئـەوە بکـات، (مـاری)ش دوای ئـەوە هەرەشەی لێکردووە، کـە ئەگـەر واز نەهێـنێ، بـە زۆر وازی پێدەهێـنێ و، دەیکـوژێ.. (لوسیان) کە ئەمەی بیست، گوتی:

ـ (بەزەییم بەو مارییە هەژارەدا دێتەوە)..

ـ (بـەڵام ئەگـەر لوسـیت بدیـبووایە، پـاش ڕۆشـتنی مـاری چـۆن گریانێك دەگریا، لە خەفەتا دەپچڕایت)!

ـ (من بە هەمان شێوە بەزەییم بە لوسیش دێتەوە)!

ـ (بە تەنها بەزەیی؟! خۆ ئەو دەزگیرانی تۆیە)!

ـ (ئەوە جاران وابوو، بەڵام ئێستا ناتوانم ئەو ژنە بێنم)!

(حەنـنە) ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو، لـە هۆیەکـەی پرسـی.. ئەویش مەسـەلەی (لوسـی)ی بـۆ باس کردو، بەڵگەنامەی ئەو خانەی نیشاندا، کە (لوسی)ی تیادا ژیاوەو، دەریدەخات، کچی (حەننە فۆرتیە)یە.

پاش ئەوە (لوسیان) گوتی: (سوێند دەخۆم بە خوا، من دلگرانم بەوەی کەوا ئەو کچە نەهێنم، دلنیام دایکیشی بێ تاوانە، بەلام خەلکی وەکو من بڕوا ناکەن)!

(حەننە) لێرەدا خەریك بوو، نهێنییەکانی خۆی بۆ بدرکێنێت، بەلام پەشیمان بوویەوەو، بێدەنگ مایەوە، ئەوە نەبێت، پرسی:

- (ئەدی لەسەر بێتاوانێتی حەننەش بێدەنگ دەبیت)؟!

- (نەخێر.. بەلکو بە دوای دۆزینەوەی بەلگە دەگەڕێم لەسەر بێتاوانێتیی، کە ئەوەش نامەیەکە لە جاك جیرۆدەوە بۆ ئەو نێردراوە، ئەو نامەیە دەری دەخات، کە جاك جیرۆد بکوژی ڕاستەقینەیە، کە من دلنیام، جاك جیرۆد ئێستاش زیندووە، بەلام بەر لە دەرخستنی بێتاوانی حەننە، ناتوانم کچەکەی حەننە بێنم)!

### ٣٣ـ (لوسیان) بە ڕاشکاوی لەگەڵ (ماری) دەدوێت:

(لوسیان) دوای ئەوەی لە (حەننە) جیابوویەوە، هاتە مالی (بۆل هرمان).. خۆی لە مال نەبوو، بەلام (ماری) پێشوازی لێکردو، چوون لە ژووری پێشوازی دانیشتن، پاش ماوەیەکی کورت، (لوسیان) گوتی:

- (خاتوونەکەم.. بێگومان دەبێت بە ڕاشکاوی قسەت لەگەلدا بکەم، لەگەل باوکیشت قسەم کردووە).

- (دەزانم!! تۆ منت خۆش ناوێت!! بەلام من خۆشەویستییەك تۆم خۆشدەوێت، وای لێکردووم، ببمە کۆیلەت)!

لێرەدا (لوسیان) بە پەرۆشییەوە گوتی: (من پێشتر بێجگەی تۆم خۆشدەویست.. بەڵام ئەمڕۆکە ناچارم ئەو ئەرکەی سەرشانم بەجێ بێنم)!

- (مەبەستت ئەوەیە: لەمەولا لوسیت خۆشناوێت)؟!

- (من ئەوەم نەگوتووە.. لوسی فریشتەیە.. بەڵام کچی حەننە فۆرتیەیە، کە ناوبراو بکوژی باوکمە)!

(ماری) ڕاپەڕی و، گوتی: (ناچێتە ئەقڵەوە!! ئەمە پڕوپاگەندەیەو، هیچی تر!! دەتەوێت بزانی لەو بارەوە من چی دەڵێم)!

- (نەخێر ئەوەی گوتم، ڕاستییە).. ئینجا بەڵگەنامەکەی گیرفانی دەرهێناو، پێیدا، (ماری) بە شەوقەوە خوێندییەوەو، دوای ئەوە بە ژێری لێویەوە گوتی: (سەرەنجام زەمان تۆڵەی بۆ سەندمەوە)!

کەمێك پاش ئەوە، (لوسیان) پێی گوت: (ئێستاکە دەبێ لەو بارە دەربازبم، کە تێی کەوتووم.. بۆ ئەوەی دڵم سەر لە نوێ ئازاد بێتەوە، ئەوەش کاتێکی پێویستە، جا دەبێ لەگەڵما بە ئارام بیت).

- (هەوڵ دەدەم، ئارام بگرم..)

لێرەدا (جاك) گەڕایەوە، گوێی لە قسەی کچەکەی بوو و، گوتی:

- (لەسەر چی ئارام دەگری ماری)؟!

ئەویش هەواڵی ئەو قسانەی پێدا، کە لە نێوان خۆی و (لوسیان) کرا، بەمە (بۆل) لە مەسەلەی کچەکەی دڵنیابوو.. هەرچی (لوسیان)یشە، لە دڵی خۆیدا گوتی: (بە ڕاستی هەژارە!! بەڵام ناتوانم لەوە زیاتری بۆ بکەم)!

### ٣٤- (ئیکسیر):

(نۆڤید) وای هەست کرد، کە (ئەماندا) بە نهێنییەکانی دەزانێت، وای لێهات، لێی بترسێت، ئەمە جگە لەو کاغەزەشی، کە لە لای بوو و، دەیزانی بەو کاغەزە دەیبەستێتەوە.. بۆیە ڕۆژێکیان پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد، هەفتەیەك بچنە سەفەر، ئەویش دوای ئەوەی مۆڵەتی لە خاتوو (نۆگستین) وەرگرت، ڕازی بوو.. بەمە (نۆڤید) چووە دارستانی پاشا، لەسەر کەنارەکانی سین و، ژوورێکی لە یەك لە هوتێلەکان بە کرێ گرت، بەو نیازەی پاش کاتژمێرێك (ئەماندا)ش بگاتە لای.. نامەیەکیشی بۆ (جاك) نووسی، تیایدا ئەم ناونیشانە نوێیەی پێ ناساند، مەبادا لەپڕ کارێکی پێی هەبێ.

ئینجا (نۆڤید) پیاسەیەکی بچوکی کرد، بەڵکو (ئەماندا) لەو ماوەیە بگاتەجێ، بینی ژمارەیەك خەڵك لەسەر گژوگیا دانیشتوون، لێیان نزیك بووەوە، دەنگی یەك لە پیاوپیرەکانی نێو ئەو خەڵکانەی بە لاوە نامۆ نەبوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: (من دڵنیام پێش ئێستا ئەو دەنگەم ناسیوە)؟!

ئەم پیاوەپیرەیە ئەو پیاوە بوو، کە لە نێو کەشتییدا (نۆڤید) دزی لێکرد، بەڵام (جاك جیرۆد) بۆی گەڕاندەوە، ئەم پیرە پیاوە لە بارەی

شلەی ئیکسیرەوە بۆ ئەوانەی دەوروبەری دەدوا، کە لە گەشتێکیدا پیاوێکی کەنەدی شوشەیەکی بە دیاری پێدابوو.

(ئۆفید) لەم قسانەی پیاوەپیرە نەگەیشت، چونکە هەر بیری لەسەر ئەوەبوو، کە ئاخۆ لە کوێ ئەو پیاوەی دیوە؟! پاش ئەوە گەڕایەوە هوتێل، بینی (ئەماندا)ش هاتووە، بۆیە دانیشتن و، دەستیان کرد، بە نانخواردن.

بۆ بەیانی، (ئۆفید) وای پیشاندا کە ماندووە، بۆیە داوای لە (ئەماندا) کرد، ئەو بە تەنیا بچێتە پیاسە، (ئەماندا)ش ڕازی بوو، بەڵام هەر ئەوەندە ژوورەکەی جێهێشت، ئیتر یەکسەر (ئۆفید) کەمێکی لەو شلەی ئیکسیرە کردە شوشەی ئەو شەرابەی (ئەماندا) حەزی پێدەکات.. بەڵام (ئەماندا) کە گەیشتە وێستگەی شەمەندەفەر، بینی خەڵکی لە دەوری گەنجێکی بووراوە کۆبوونەتەوە، زانی: ئەم گەنجە لە کاتی بەیەکدادانی دوو شەمەندەفەر بە سوکی زامدار بووە، کە (ئەماندا) لێی وردبووەوە، ناسیەوە، ئەوە (دۆشمان)ی کۆنە هاوڕێی بوو.. بەڵام هیچی نەگوت و، گەڕایەوە هوتێل.

ئێوارە (ئۆفید) ئەو شەرابەی پێشکەشی (ئەماندا) کرد، کە حەزی پێدەکات، ئەویش زۆری لێخواردەوە، تا وای لێهات سوورهەڵگەڕاو،

هەستی بە تێنووەتییەكی زۆر كرد.. لێرەدا (ئۆفید) زانی ئیكسیرەكە كاری خۆی كرد، بۆیە پرسیاری لە (ئەماندا) كرد:

ـ (ئایا ئەو پیاوە پیرە دەناسی؟ كە لە كۆگاكەی نزیك ماڵی لوسی خەنجەرەكەی كڕی)؟

(ئەماندا) بە چاوێكی پڕ لە ڕك تەماشای (ئۆفید)ی كردو، پێی گوت: (وادەزانی من ناتناسم؟! نازانم تاوانبارێكی چەند ترسناكی و؟! ویستت لوسی بكوژی)؟!

(ئۆفید) ترسا لەوەی یەكێك گوێی لەم هاوارو قسانەی بێت، بۆیە بۆی هەڵسایەوە وسكوتی بكات، بەڵام (ئەماندا) زیاتر هاواری كرد: (لێمگەڕێ بێ دین.. من دەزانم تۆ بارۆن ئارنۆڵد نیت.. بۆیە هەموو هەوڵم بۆ ئەوەیە هەقیقەتی تۆم بۆ دەركەوێت و، بتدەمە دەستی پۆلیس)!

دوای ئەوە (ئەماندا) بوورایەوەو، كەوتە سەر زەوی، (ئۆفید) لەوە ترسا بمرێت، بۆیە داوای پزیشكی بۆ كرد، هەر لەو هوتێلەدا وا ڕێككەوت پزیشكێكی لێبوو، ئەمە برادەری ئەو پیرەپیاوە بوو، كە (ئۆفید) دزی لێكردبوو، ئەو سەركەوت و، هاتە ژوورەكەی (ئۆفید) و (ئەماندا).

كاتێك پزیشكەكە ئەو بارە تێكچوونەی بینی، كە (ئەماندا)ی تێكەوتووە، داوای لە (ئۆفید) كرد، بە پەلە بچێت، شلەی (ئەمۆنیاك)ی بۆ بێنێت، بۆ ئەوەی (ئەماندا)ی پێ چارەسەر بكات..

هەروەها پزیشکەکە بە (ئۆفید)ی گوت: (بێگومان تۆ چوویتە ئەمریکا)؟!

(ئۆفید) بە بیری هاتەوە، ئەو پیاوەی لە پێشی وەستاوە کێیە!! بۆیە وەڵامی دایەوە: (نەخێر گەورەم).

ـ (بە هەر حاڵ.. ویستووتە نهێنییەکانی ئەو ژنە بزانیت، بۆیە شلەی ئیکسیرت دەرخوارد داوە، بەڵام ئەوەش بزانە، گەر خودا منی لێرەدا نەگەیاندبووایە فریای، ئەوا گیانی لە دەست دەدا).

دوای کەمێك پزیشکەکە (ئۆفید)ی دڵنیاکرد، کە مەترسی لەسەر (ئەماندا) نەماوەو، ڕۆیشت.. بۆیە (ئۆفید)یش سوپاسی پزیشکی کردو، سوپاسی خوای کرد، لەسەر ئەوەی (ئەماندا)ی ڕزگارکردو، نەمرد، دەنا دەبووە مایەی کێشەیەکی گەورە لە بۆی!

## ٣٥ـ (گەڕانەوە بۆ پاریس):

با کەمێك (ئۆفید) و (ئەماندا) جێبهێلین و، بگەڕێینەوە بۆ پاریس.. (لوسی) لە بەرامبەر (لوسیان)ەوە زۆر نیگەران بوو، ڕۆژی یەکشەم تێپەڕی و، نەهاتە سەردانی، (حەننە)ش نەیوێرا ڕاستییەکە بە (لوسی) بڵێت.

بۆ ئێوارە (لوسی) چووە ماڵی (لوسیان)، بەڵام دەرگاوانەکە پێی گوت: (سەفەری کردووە)!

کەچی (لوسی) تەماشای کرد، تریسکەی ڕوناکی لە ژوورەکەی (لوسیان) دەهات، بۆیە هەوڵی دا بچێتە ژوور، بەڵام دەرگاوانەکە ڕێگەی نەداو، پێی گوت: (بەڕێز لوسیان لابرۆ وەسفی تۆی پێداوم و، فەرمانی پێکردووم، لەمەولا نەهێڵم بێیتە ئێرە).

(لوسی) خەریك بوو، شێت دەبوو، بە پەلە گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی و، دەستی کردە گریان، (حەننە) هەوڵی دا، هێمنی بکاتەوە، پێی گوت: (پێدەچێت لەبەر هۆگەلێکی مەعقول تۆی جێهێشتبێت)!

- (ئەو هۆگەلە مەعقولانە چین)؟!

- (لوسی.. هەوڵ مەدە، ئەو هۆیانە بزانیت)!

- (کەوابێت، تۆ دەزانی ئەو هۆیانە چین)؟!

(حەننە) شڵەژا، دوای ئەوە گوتی: (ئەو ڕۆژە.. لوسیان هاتە لام.. هەندێ شتی پیشان دام، نەمدەویست پێتی بڵێم، بۆ ئەوەی لە غەم و ئازار دوورت بخەمەوە)!

بەڵام (لوسی) هەڕەشەی لێکرد، گوتی: (ئەگەر تۆ پێمی نەڵێیت، ئەوا دەچمە نووسینگەی لوسیان و، ناچاری دەکەم، هەڵوێستی خۆیم بۆ ڕوونبکاتەوە).

ئەو کاتە (حەننە) چ چاری نەما، بۆیە بە (لوسی)ی گوت:

- (تۆ کچی حەننە فۆرتیە)ی.. لێرەدا (لوسی) لە پڕمەی گریانی داو، هێندە گریا، خەریك بوو، دەخنکا!

(حەنـنە)ش کە وەهای دیت، خەریك بوو، پێی بڵێت، من دایکی تۆم و، بێ تـاوانم، بـەڵام ئـەو قسـەیەی نەکـرد، چونکە بەڵگەیەکی لەسەر بێ تاوانێتی خۆی نەبوو!

بـە (لوسـی)ی گـوت: (لوسـی خـان.. لـە ڕەحمـەتی خـوا بـێ ئومـێد مەبە.. بێگومان خواگیان بێ تاوانێتی دایکت دەردەخات).

لـەو کاتـەدا (لوسـیان)یـش دڵـی زۆر تـەنگ بـوو، بۆیـە بـڕیاری دا، بچـێتە سـەردانی (جـۆرج فۆرتیـیە)ی هـاوڕێی.. ئـەو کاتـە (جـۆرج) لەگـەڵ (ئیتـیان)ی وێنەکـێش بـوو.. دوای ئـەوەی (لوسـیان) دانیشـت، پـێی ڕاگـەیاندن، کـە بـۆی دەرکـەوتووە، ئـەو کچـەی حەزی لێکردووە، کچی (حەننە فۆرتیە)یە.

وێنەکێشـەکە لەبەر زۆر سەرسام بوونی هەڵسایەوەو، بە (لوسیان)ی گوت: (کێ ئەوەی بۆ تۆ چەسپاند)؟!

- (بەڕێـز هـرمان خـۆی.. بەڵگەنامەکەشـی لـە گونـدی جوانیـیەوە هێناوە، ئەو گوندەی کە لوسی بە منداڵی تیای ژیاوە).

- (بـەڵام بەڕێـز هـرمان بـۆ ئـەو بەڵگەنامـەیەی هێـنا؟! یان باشە بۆ ئەوەی بە بیردا هات، کە دەشێ لوسی کچی حەننە فۆرتیە بێت)؟!

- (نـازانم؟! بـەڵام ئابـڕووی خـۆم وام لـێدەکات، تـازە مـن ئـەو کچـە نەهێنم)!

(جـۆرج) ئـەو کاتـە هاتـە قسـە: (لوسـیان ئـەم قسـەیەت ڕاسـتە.. پێویسـتە لوسـی لـە بـیر بکـەیت و، کچـەکەی بـۆل هـرمان بخوازیـت).. ئینجا ڕووی بۆ (ئیتیان) سووڕاندو، پێی گوت: (تۆش لەگەڵم نیت)؟!

(ئیتیان) گوتی: (بەڵکو ڕای من بە پێچەوانەوەیە.. چونکە ئەو قەدەرەی لوسی و لوسیانی لەگەڵ یەك کۆکردەوە، دەتوانێت لوسیان و حەننە فۆرتیەش لەگەڵ یەك کۆ بکاتەوە).

(جۆرج) بەرهەڵستی کردو، گوتی: (بەڵام دەشێ ئەو قەدەرە وا زوو نەهێتە پێش و، ئایندەی لوسیان لە دەست بچێت)!

(ئیتیان) گوتی: (کەوابێت: باش وایە لوسیان بۆل هرمان بە هەڵە ببات و، وای تێبگەینێت، کە کچەکەی ئەو دەخوازێت، لەو کاتەشدا بە دوای حەننەو جاك جیرۆددا بگەڕێت، کە بێگومانم جاك جیرۆد لە شوێنێکی ئەو پاریسە هەر ماوەو، دەژی).. ئینجا ڕووی لە (لوسیان) کردو، پێی گوت:

- (لە بەیانییەوە بە هەندێ لێکۆلینەوەی تایبەت هەڵدەستم، بەڵام تۆ لە بارەی ئەو داهێنراوە قسەم بۆ بکە، کە باوکت بەر لە کوژرانی خەریکی داهێنانی بوو).

- (ئامێری صەقلکردن بوو).

(ئیتیان) سەری بادا!! وەك ئەوەی شتێکی بیرکەوتبێتەوە!! بۆیە هەر لەو شەوەدا هاتە نێو کتێبخانەی ماڵەکەی خۆی، دۆسیەیەکی کردەوە، لەسەری نووسرابوو: (جۆرج داریە ١٨٦١)، کەوتە خوێندنەوەی ئەو دۆسیەیە، تیایدا باسی جاك جیرۆد و بۆل هرمانی وردتر خوێندەوە.

### ٣٦ـ (ئەماندا بە هۆش خۆی دێتەوە):

(ئـەماندا) بـۆ بەیانی ڕۆژی دووەم هاتەوە خۆ، لە (نۆفید)ی پرسی: (شەو چیم لێهات)؟!

(نۆفید) وەڵامی دایەوە: (تەنها لەخۆ چوویت).

بـەڵام (ئـەماندا) زانـی (نۆفـید) درۆ دەکـات و، ئـەوەی بەسـەریدا هـاتووە، شـتێکی ئاسـایی نـەبووە، بۆیـە زیاتـر گومـانی لەسـەری بـۆ دروسـتبوو، لـەوەی کـەوا نـاوی خـۆی نـاوە (بـارۆن) و، بـڕیاری دا، لەمەولا زیاتر خۆی لێبپارێزێت.. ئینجا بە (نۆفید)ی گوت:

ـ (مـن نامەیـەك بـۆ خاتو ئۆگستین دەنووسم، داوای لێدەکەم ماوەی مۆڵەتەکەم حەفتەیەك بۆ درێژ بکاتەوە).

ـ (ئاسـاییە.. بـەڵام من بە لای کەم، دەبێ دوو ڕۆژ لێت جیا ببمەوە، چونکە بە ژنەکەم گوتبوو، لە حەفتەیەك زیاترم پێناچێت).

ئـیتر دوو کاتژمێر پاش ئەوە، (نۆفید) هوتێلی جێهێشت، لە کاتێکدا لـە کۆڕنیشـی سـین دەڕۆیشـت، چـاوی بـەو پزیشـکە کـەوت، کـە چارەسـەری (ئـەماندا)ی کـرد، سلاوێکی بۆ کرد، پزیشکەکە بە ساردی وەڵامـی سـڵاوەکەی دایـەوە، ئـەو پـیاوەپیرەش، کـە لەگـەڵ پزیشـکەکە بـوو، سـەرنجی دەسـتە کوتـراوەکانی (نۆفـێد)ی بـە وردی داو، بـە پزیشکەکەی گوت:

ـ (بـا لەسـەر ئـەو گـیایە دابنیشـین و، سـەربردەی ئـەو پـیاوەت بـۆ بگێڕمەوە)!

خودا وایکرد، لەوکاتەدا (ئەماندا)ش هاتبووە دەر بۆ پیاسەو، لە نزیك ئەو شوێنە دانیشتبوو، کە پیاوەپیرەو پزیشکەکەی لێ دانیشتبوون، بەڵام ئەوان ئەویان نەدەدیت، پیاوەپیرە بە پزیشکەکەی گوت:

- (ئەو پیاوە ساڵی ١٨٦١ ویستی ماڵ و سامانەکەی من بدزێت)!

- (بەڵام تێناگەم!! ئەم ناوی نۆفید بوو و، ئەوەش ناوی بارۆن ئەرنۆڵدە)؟!

- (ئاخەر ئەوە ساختەچییەکی گەورەیە، ناوی خۆی گۆڕیوە، دەنا ناوی نۆفید سۆلیڤۆیە).. ئینجا پیرەپیاو بە درێژی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوەو، (ئەماندا)ش بە وردی هەموو قسەکانی ئەزبەر کرد، بێ ئەوەی وشەیەکی لێ بفەوتێت.. دوای ئەوە پزیشکەکە بە هاوڕێیەکەی گوت:

- (دە ئەم نۆفیدە.. ئەم شەو شلەی ئیکسیری دەرخواردی ئەو ژنە دابوو، کە لە هوتێل لەگەڵیدایە، بۆ ئەوەی توشی بارێکی بێ ئاگایی بێت و، نهێنییەکانی بدرکێنێت).

دوای ئەوە هاتنە سەر باسێکی تر، (ئەماندا)ش گەڕایەوە هوتێل و، ڕقی دنیای لە (نۆفید) هەڵسا، بڕیاری دا، تۆڵەی لێبکاتەوە.. ئینجا داوای لە یەك لە ژنە خزمەتکارەکانی نێو هوتێل کرد، دیدارێکی لەگەڵ (دۆشمان) بۆ ڕێك بخات، کە پزیشك ئامۆژگاری ئەوەی بۆ کردبوو، لە هوتێل دەرنەچێت و، پشوو بدات.. ژنە خزمەتکارەکەش بەڵێنی جێبەجێکردنی ئەم داوایەی پێدا.

### ٣٧ـ (لە کارگەی دروومان):

(مـاری) دوای ئـەوەی تەندروسـتی بـەرەو باشـی هاتـەوە، چـووە کارگەی خاتوو (ئۆگستین)، ئەو خاتونە وەك جاران پرسیاری لێکرد:

ـ (دەتەوێت لوسی جلی بوکێنییەکەت بدوورێت)؟

(ماری) بە توڕەیی وەڵامی دایەوە:

ـ (تکا دەکەم خاتون.. ناوی ئەو کچە لە لای من مەبە)!

ـ (باشە بۆچی)؟!

ـ (نامـەوێ بچمە نـاو ئـەو باسـە.. بـەڵام ئـەوەنـدە هەیـە، لەمـڕۆ بە دواوە، مـن نامەوێـت ئـەو کچـە نـە جلەکانی مـن بدوورێـت، نـە بێتە ماڵی ئێمە)!

ـ (بەڵام بەو قسانەت واتلێکردم، گومان لەو کچە بکەم)؟!

ـ (هیچی لەبارەوە ناڵێم).

لـێرەدا (لوسـی) دەرگـای کـردەوەو، هاتـە ژوور، دیـاربوو زۆر ماندوو بوو، کاتێکیش (ماری) بینی، موچڕکی بە گیاندا هات و!! گوتی:

ـ (ناپاکی دەستی پێکرد و، ئەوەتا ئەتۆش تەواوی دەکەیت)!

خاتو (ئۆگستین) شڵەژاو، گوتی:

ـ (ئەو قسە چییە دەیکەیت)؟!

ـ (بـبوورە خاتونەکـەم.. بـەڵام ئەو بێویژدانە هاتووە نەمیمی بکات و، لەکە بە ئابڕووی منەوە بنێت)!

بەمـە (مـاری) ڕقـی زیاتـری لـە (لوسـی) هەڵسـاو، بـە خـاتوو (ئۆگستین)ی گوت:

- (لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستە ناشرینەی لە دەرهەق مندا کردی، بێدەنگ دەبیت)؟!

بەر لە وەڵامی خاتوو (ئۆگستین)، (لوسی) درێژەی بە قسەکانی داو، گوتی:

- (کچێ وس بە.. لە بیرت چوو، تۆ بوویت یەکەم جار دژایەتی منت کرد)؟!

(ماری) هەوڵیدا بچێتە دەر، بەڵام (لوسی) قۆڵی گرت و، گوتی:

- (ئەو نەفرەتییە لێرە ناچێتەدەر، بەر لەوەی لە پێشیدا پێی بسەلێنم، کە من بێ تاوانم)!

ئینجا ئەوەی بۆ خاتوو (ئۆگستین) گێڕایەوە، کە (ماری) چووبووە ماڵیان و، داوای لێکردبوو.. کاتێکیش لە قسەکانی بوویەوە، (ماری) بە زمانێکی زۆر ناشرین و، قیناوی بە (لوسی)ی گوت:

- (ناترسیت ئاشکرات بکەم؟! وا دەزانی نازانم ناوت چییە)؟!

(لوسی) وەڵامی دایەوە: (ئەگەر مەبەستت دایکم بێت؟! ئەوا ئەو تاوانەی بە ناڕەوا دەدرێتە پاڵ ئەو، ئەگەر ڕاستیش بێت، من هیچ پەیوەندییەکم پێیەوەی نییە!! کار لە پاکێتی من ناکات!! بەڵێ من کچی ئەو حەننە فۆرتییەمە، کە گوایە کارگەی سووتاندووەو، پیاوی کوشتووەو دزی کردووە)!!

(ماری) ڕووی بۆ خاتوو (ئۆگستین) وەرگێڕاو، پێی گوت:

- (یان دەمری دەکەیت.. یان من لە کارگەکەت دەچمە دەر و، جارێکی تر نایێمەوە لات)!

(ئۆگستین) بۆ ئەوەی (ماری)ی دەوڵەمەندی لە دەست نەچێت، بە دڵڕەقییەوە بە (لوسی)ی گوت:

- (ئیتر تۆ جێت لای من نەما.. هەر ئێستا پارەی ئەو چەند ڕۆژ کارەت دەدەم، کە لە لامەو، جارێکی تر نەهێیتەوە لام)!

(لوسی) بینی بەوە خەندە لەسەر لێوی (ماری) دروست دەبێت!! پێی گوت:

- (بە داگیرکردنی هاوسەرەکەم وازت نەهێنا؟! ئەوەتا دەبیتە هۆی بڕینی ڕۆزیشم؟! بەڵام دڵنیابە: ڕۆژێك دێت، خوای گەورە ئەو تۆڵەیەت لێدەکاتەوە)!

ئینجا رووی بۆ خاتوو (ئۆگستین)یش وەرسووڕاندو، بە دەنگێکی کز بەویشی گوت:

- (خاتوونەکەم.. دڵڕەقیت بەرامبەرم نواند)!

پاش ئەوە ڕۆیشت.

لەوکاتەدا (جۆرج داریە) لە دەرەوەی ماڵ بوو، فایلێکی پێ بوو، هەندێ کاغەزی گرنگی تیابوو، دووان سیانێك لەو کاغەزانەی لێکەوت، بەبێ ئەوەی ئاگاداری بێت، قەدەر وای کرد، (حەنە)ش لەوکاتەدا بەرەو ماڵ دەهاتەوەو، لە ڕێگا ئەو کاغەزەی دیتەوە، ئیتر سووربوو لەسەر ئەوەی بۆ خاوەنەکەی بگێڕێتەوە، چونکە ناوی خاوەنەکەی لەسەر نووسرابوو.

(لوسی) گەڕابووەوە ماڵ و دەگریا، کاتێك (حەننە) هاتەوە ماڵ، ترسا لەو گریانەی؟! بۆیە بە زوویی پرسیاری هۆیەکەی لێکرد، وەڵامی دایەوە:

- (خاتوو ئۆگستین داغی کردم.. دەری کردم و، ڕزقی بڕیم)!!

(حەننە) پرسی:

- (باشە لەسەر چی)؟!

(لوسی) تێیگەیاند، کارەکە چۆن گەیشتە ئەوەو، لە کۆتاییدا گوتی:

- (هەموو ئەوە ڕوویدا.. چونکە من کچی حەننە فۆرتیەمە)!

لێرەوە (حەننە) بەوە دڵی (لوسی)ی دایەوە، کە بچێت شکایەت لە (ماری) بکات، ئینجا هەواڵی ئەوەی پێدا، کە چەند کاغەزێکی گرنگی پارێزەرێکی دۆزیتەوە، ناوی (جۆرج دارییە)یەو، گوتی:

- (ئێستا دەچم ئەو کاغەزانەی بۆ دەبەمەوەو، داوای لێدەکەم لەو شکایەتەی تۆش لە بەردەم دادگا، بەرگری لە مافی تۆ بکات).

(لوسی) گوتی:

- (ئاخەر ئەو پارێزەرە برادەری لوسیانە، من دەترسم لوسیان ساردی بکاتەوە، لەوەی بەرگری لە من بکات)؟!

(حەننە) گوتی:

- (خەمی ئەوەت نەبێت.. من وا دەکەم بڕوا بە لوسیانیش بکەم، کە هەق هی تۆیە).

دوای ئەوە (حەننە) هاتە نووسینگەی پارێزەر (جۆرج دارییە)، بەڵام خزمەتگوزارەکە پێی گوت:

- (جۆرج داریـیه لـێره نیـیه.. سەفەری کردووەو، دوای هەفتەیەکی تر دەگەڕێتەوە)!

(حەنـنه) بـه دڵی سارد گەڕایەوە ماڵ و، بینی تایەگی گەرم (لوسی) گرتووە، بۆیه بە پەلە چوو پزیشکێکی بۆ هێنا.

۳۸- (بڕیاری تۆڵەکردنەوە):

(دۆشمـان) ئـەو لاوە بریـنداره ناچـار بـوو، گونـدی (جوانـی) جێبهێڵێت، چونکە خـەڵکی ئـەوێ تێبیـنی ئـەوەیان کـردبوو، کە ئەو گەنجـه زۆر لە مووچەی خۆی زیاتر خەرج دەکات، دیاره ئەوەشی لەو پارەیه خەرج دەکرد، کە (ئۆفید) پێی دەدا.

کاتێکـیش کوێخـای گوندەکـه بـەوەی زانـی، کـه خەرجیـیەکی زۆر دەکـات، بـانگی کـردو، داوای لـێکرد، بـۆی ڕوونبکاتەوە، کە ئەو هەموو پارەیـه لـه کـوێ دێنێت؟! بـەڵام (دۆشمـان) لـه ترسی ئەوەی ئابڕووی زیاتـری نەچـێت، ئـەوەی ڕەتکـردەوە، کـه وەڵامـی دروسـتی بداتـەوە، لەبـەر ئـەوە کوێخـا لـه ئیشـەکەی وەلای نـا، بەمـەش ناچـار بـوو، گوندەکە جێبهێڵێت و، لە شوێنێکی تردا بە دوای کاردا بگەڕێت، ئیتر سـواری ئـەو شـەمەندەفەره بـوو، کـه توشـی ئـەوەی کـرد، کـه پێشـتر تیشکمان خستە سەری.

(ئـەماندا) وەکـو گوتمـان، داوای لـه یـەك لـه ژنـه خزمەتگوزارەکانی هوتـێلەکەیان کـرد، دیدارێکـی لەگـەڵ (دۆشمـان) بـۆ ڕێـك بخـات، کـه

ئەوەشی بۆ جێبەجێ بوو، (دۆشمان) سەری سوورِما، لەوەی کەوا (ئەماندا) لەو هوتێلە بێت!! بۆیە (ئەماندا) دڵنیای کرد، کە ترسی نەبێت و، داوای کرد، لەوەی پێشتر لە دەرهەقی کردوە بیبوورێت..

ئینجا لێی پرسی:

- (تۆ بارۆن ئەرنۆڵد دەناسیت)؟

- (نا.. ئەو بارۆنە کێیە)؟!

- (ئەو پیاوەیە، کە لە جوانی لەگەڵتدا دانیشت و، دوو سەنەدی ساختەی لێت سەند)!

(دۆشمان) تێکچوو و، گوتی:

- (ئەمەت چۆن زانی)؟!

- (هەمان شتی لەگەڵ منیش کرد)!

ئینجا هەواڵی ئەو کاغەزەی پێدا، کە لە بارەی ئەودوە (ئۆفید) لەلای خۆی پارازتوویەتی و، پێی گوت:

- (ئەو پیاوە مایەی مەترسییە بۆ من و، بۆ تۆش.. بۆیە دەبێت هەردووکمان رێککەوین، لەسەر دارِشتنی پلانێك بۆ بەرگری کردن لە خۆمان).

- (بەڵام ئەوە چۆن بکەین)؟!

- (بۆ ئەوەی لەوەدا سەربکەوین: پێویستە یەکەمجار تۆ لێی نەترسێیت.. چونکە نهێنی ئەو لەلای منە، دەزانم چۆن هەوڵی دا کچێك بکوژێت، کە ناوی ئەو کچە لوسییە..)

- (لوسی؟! ئەوە ناوی ئەو کچەیە، کە پارەی دا بە من، بۆ ئەوەی بەڵگەنامەکانی تایبەت بە ئەو بێنم، لەو خانەیەی تێیدا ژیاوە بە منداڵی).

(ئەماندا) زانی لەم یەکەم هەنگاوەی سەرکەوت، بۆیە پێکەنی!! ئینجا بە (دۆشمان)ی گوت:

- (ئەو پیاوە تاوانبارێکی ترسناکە!! ناوی ڕاستەقینەی خۆی ئۆفید سۆلیڤۆیەو، هەوڵی دا منیش بکوژێت)!

(دۆشمان) بە سەرسووڕماوییەوە!! گوتی:

- (کەوابێت دوژمنێك ئێمەی کردەوە هاوپشکی کار؟! بە ڕاستیش دوژمنێکی ترسناکە!! پێویستە بەر لەوەی زەفەرمان پێ ببات، ئێمە کۆتایی بە ئەو بێنین).

بەم شێوەیە (ئەماندا) و (دۆشمان) ڕێککەوتن، لەسەر ئەوەی تۆڵە لە (ئۆفید) بکەنەوە.

بۆ بەیانی ڕۆژی دووەم.. (ئەماندا) گەڕایەوە پاریس و، لە خاتوو (ئۆگستین)ی بیست، کە بە هۆی (ماری)ی کچی (بۆل هرمان)ەوە ئەو (لوسی)ی دەرکردووە، چونکە (لوسی) کچی ژنێکی تاوانبارە بە دزی و پیاوکوژی، هەروەها ئەوشی زانی، کە (ماری) و (لوسیان) بەو زووانە ئاهەنگی هاوسەرگیرییان دەگێڕن.

لەم قسانەدا (ئەماندا) بە زیرەکی خۆی، ئەوەی بۆ دەرکەوت، کە: (ئۆفید) بۆ بەرژەوەندی (بۆل هرمان) کاری کردووە، کە لە بارەیەوەی قسەی بۆ کردبوو و، زانیبووی (بۆل) داوای لە (ئۆفید)

کردبوو، (لوسی) بکوژێت.. بەڵام کە لەو کاریدا سەرنەکەوتبوو، داوای لێکردبوو، ئەو بەڵگەنامەی بۆ پەیدا بکات، کە وەدەری دەخات، (لوسی) کچی (حەننە فۆرتیە)یە، بەو نیازەی بەوە ئابڕووی (لوسی) ببات، کە ئەوەشی کرد، ئیتر دڵی (لوسیان) لەسەر (لوسی) سارد بکات، لەوەی کەوا بیهێنێت، چونکە بەوە تاوانباری دەکات، کە (لوسی) کچی بکوژی باوکی بێت، کە لەوەش سەرکەوت، ئینجا بیری بخاتە سەر ئەوەی (ماری) کچی ئەو بهێنێت!!

پاش ئەوە (ئەماندا) تا ڕۆژی یەکشەممە چاوەڕوانی کرد، ئینجا گەڕایەوە هوتێل، لەوێ ئەو بۆچوونانەی خۆی بۆ (دۆشمان) ڕوونکردەوە، ئەویش پشتگیری ئەو ڕایانەی کردو، پێکەوە بەڵێنیان تازە کردەوە، تۆڵە لەو تاوانبارە ترسناکە بکەنەوە.

٣٩- (لە ماڵی ئیتیان):

(ماری) مەسەلەی (لوسی) بۆ باوکی نەگێڕایەوە، چونکە لە ناخی خۆیدا وای هەست دەکرد ستەمی لە (لوسی) کردبێت، بەوەی کەوا لە دەرهەقی کردی و، بووە هۆی نانبڕینەکەی.

بۆیە لەگەڵ باش بوونی بارە تەندروستییەکەیشی، ئەو هەست بە تاوانبارێتی و ستەمکردنەی لە ناخیدا لێی جیانەدەبووەوەو، وای لێکرد بەرەو خراپی بێتەوە، (لوسیان) ئەوەی دەزانی و، بەزەیی پێیدا دەهاتەوە، بەڵام وایدەبینی هێنانی (ماری) وەکو هاوسەرێك بۆ

ژیانی، ئەوە مەحاڵە، (جاك)یش چاوەڕێی دەکرد، (لوسیان) لەو بارە سۆزاویەیدا ڕزگاری بێت، بۆ ئەوەی ئەوسا داوای لێبکات، (ماری)ی کچی بخوازێت.

لەو ڕۆژەی کە (ئەماندا) چووە دارستانی پاشا، بۆ بەسەربردنی مۆڵەتەکەی، (ئیتیان)ی وێنەکێش بۆ پێشوازی کردن لە (جۆرج) خۆی ئامادە دەکرد، (لوسیان)یش لە ماڵی خۆی بوو، سەرەتا (لوسیان) هات و، لە (ئیتیان)ی وێنەکێشی پرسی:

- (ئەوەم بۆ دەرکەوت، کە حەننە فۆرتیە ناگەڕێتەوە بەندیخانە)!

- (کەوابوو ئومێدی ئەوە نییە، بە دیداری بگەم)؟!

- (تەنها قەدەر دەتوانێت ئەوەت بۆ بکات، بەڵام پێم بڵێ: ئایا بە ڕاستی ئێستاکە لە ماری نزیك دەکەویتەوە)؟!

- (تا ڕادەیەك.. بەڵام ئەو کچە سوودی چی تیایە؟! خۆ لە ڕۆخی گۆڕدایە)!

- (سوودێکی تیایە، دەشێ تۆ پێی نەزانی!! دواتر نەخۆشیەکەی دەبێ وات لێبکات، لێی نزیك ببیەوە، بە شێوەیەك وا تێبگات، دەتەوێت بیخوازیت، تا ئەگەر مرد بە ئاسوودەیی بمرێت)!

- (وا پێدەچێت، تۆ شتی زۆر بزانیت، بەڵام لە منیان بشاریتەوە)!

- (نا.. بەڵام زۆر جار شتی دروست دەکەوێتە دڵم.. ئەوەتا من وا هەست دەکەم، بکوژی باوکت دەدۆزینەوە، حەننە فۆرتیەش دەبینین، لوسیش دەبێتە خێزانی تۆ.. بۆیە هەموو ئەوەی لە تۆم دەوێت،

تکایە تا دوو هەفتەی تر چیم پێگوتی بە قسەم بکەو، هیچ داوایەکم ڕەتمەکەوە)!

- (ئەگەر تۆ بەرژەوەندی لەوەدا دەبینیت؟! ئەوا من لەژێر فرمانی تۆ دەبم).

- (کەوابێت: یەکەمجار دەبێت ئەو بەلگەنامەیەم بۆ بێنی، کە زۆرجار قسەت بۆ لەسەر کردوم، کە ژیاننامەی لوسیی تیایە).

- (بەیانی بۆتی دێنم).

لێرەدا (جۆرج)یش هات و، سلاوی لە (لوسیان) و (ئیتیان) کرد، پاش کەمێك پێی ڕاگەیاندن، کە ئەو چەند کاغەزێکی گرنگی ون کردووە، دوای ئەوە نانیان خواردو، لە پاشان چوونە ژووری ڕەسمکردن.

لێرەدا خزمەتکارەکە هاتە ژوورو، بە (ئیتیان)ی گوت:

- (کچێك بە ناوی ماری بۆل هرمان دەیەوێت، بتبینێت).

- (با بێتە ژووردوە).

(ماری) هاتە ژوورەوەدو، بە بینینی (لوسیان) دڵی خۆشبوو، دوای ئەوە بە (ئیتیان)ی گوت:

- (پاش کەمێکی تر باوکم دێتە ماڵتان، بۆیە هاتوومەتە ماڵتان، تا ئەو وێنەیە لە کاغەز بگری، کە بە بۆنەی یادی لە دایك بوونی باوکم پێشکەشی دەکەم، بۆ ئەوەی بۆی ببێتە شتێکی چاوەڕوانەکراوو خۆش).

(ئیتـیان) گوتی: (مەترسە).. ئینجا پێی گوتەوە: (ئێمە پێش ئێستا پیرۆزبـایی ئـەوەمان لـە لوسـیان دەکـرد، کـە سووورە لەسـەر ئەوەی تۆ بخوازێت)!

چـاوەکانی (مـاری) لـە خۆشـیاندا گەشـانەوە، سـەیری (لوسـیان)ی کردو، گوتی:

ـ (لوسیان.. ئەوە ڕاستە)؟!

(لوسـیان) لەبـەر ئـەوەی وادەی بـە (ئیتـیان) دابـوو، لـە قسـەی دەرنەچێت، بۆیە وەڵامی دایەوە: (بێگومان خاتوونەکەم)!

(ئیتـیان) هەڵیدایەوە قسەو، گوتی: (لوسیان دوای ئەوەی دڵنیابوو، ئاسـوودەییەکەی بـەوە وەدی دێـت، تـۆ بخوازێـت، بڕیاری ئەوەی داوە، منیش ئاسوودە دەبم، ئەگەر شایەدی ئەو مارە بڕینە ببم)!

بـەڵام (جـۆرج) کـە هیچـی بـەم ڕێککەوتـنەی نـێوان (لوسـیان) و (ئیتـیان) نـەدەزانی، بـەم قسانەی دەیبیست سەری سووڕمابوو!! پاش ماوەیێکیش (بـۆل هـرمان) گەیشـت، لەگـەڵ ئامـادەبووان دانیشـت و، پاش کەمێك بە (ئیتیان)ی گوت:

ـ (بۆیـە هاتوومەتـە لات، دەمەوێـت پرسـیاری تابلۆیەکـت لێـبکەم، گوایە کاتی خۆی ڕۆفائیل دروستی کردووە).

ـ (ئـەوەت پێشـان دەدەم، بـەڵام سـەرەتا ڕێگـەم بدە ئەوەت پێ بڵێم، کـە مـن نـیازمە لـە بـاتی لوسـیان بێمە سـەردانت، چونکە لوسیان بێ باوکە)!

(بۆل هرمان) پێکەنی و، گوتی: (لە مەبەستت گەیشتم)!

- (بەڵێ گەورەم.. بۆ ئەوە دێمە لات، ماری کچت بۆ لوسیان لێ بخوازم)!

- (من پڕ بە دڵ بەوە ڕازیم)!

(ماری) هەڵسایەوە بە گریانەوە باوکی ماچکردو، گوتی:

- (ئەمە فرمێسکی خۆشییە.. تکا دەکەم بمبووریت)!

دوای ئەوە (ماری) ڕۆیشت، باوکی جێهێڵا بۆ ئەوەی نانی ئێوارە لەگەڵ ئامادەبووان بخوات، دوای نانخواردنەکەش، (بۆل هرمان) دەوقەی لەگەڵ (لوسیان) کردو، پێی گوت:

- (سوپاست دەکەم لوسیان.. ئاسوودەییت خستە دڵی من و کچەکەم)!

کەمێك دوای ئەوە (جۆرج) داوای لە (ئیتیان) کرد، تابلۆی ئەو ڕووداوەیان پێشان بدات، کە بیست و یەك ساڵ پێشتر لە ماڵی پیاوە ئاینییەکە ڕوویدابوو، (ئیتیان)یش هەڵسا پەردە لەسەر تابلۆکە لابدات، لە هەمان کاتدا چاوەدێری (بۆل هرمان)یشی دەکرد، بینی هەر هێندە (بۆل هرمان) سەرنجی تابلۆکەی داو، چاوی بە وێنەی حەننە فۆرتیە کەوت، ئیدی یەکسەر شڵەژا، بەڵام ئەم شڵەژانەی شاردەوە، بەڵام (ئیتیان) بە باشی بەدیی کردبوو، (بۆل) لێی پرسی:

- (ئەم تابلۆیە بەلای تۆ چی دەگەیەنێت)؟

(ئیتیان) ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، لەولاوە (لوسیان)یش گوتی: (ماشەڵڵا!! چییە ئەو لێکچوونە سەیرە)؟!

(ئیتـیان) پرسـی: (مەبەسـتت ئەوەیـە بڵـێی لوسـی بـە حەنـنە دەچێت؟! ئاخەر لەبیری مەکە، حەننە دایکی ئەوە)!

- (مەبەستم ئـەوە نییـە.. مەبەستم ئـەو لێکچوونەیە، کە لە نێوان حەنـنەو، لە نێوان بێوەژنێکدا هەیە، ناوی لیزایە، ژنێکی نانفرۆشەو، لەگەڵ لوسی پێکەوە نیشتەجێن)!

(بـۆل هـرمان) دیسانەوە شـڵەژا!! لـە دڵـی خۆیـدا گوتـی: (ئایا دەبێ ئـەو ژنـە نانفرۆشەی لوسیان قسەی لە بارەوە دەکات، هەر ئەوە خۆی حەنـنە فۆرتـیە بێت؟! پاشـان ئـاخۆ دەچـێتە ئەقڵ دوای ئەو هەموو ماوەیە، نهێنییەکانی من ئاشکرا ببن)؟!

بـەڵام (بـۆل) ئـەمجارەش شڵەژاویەکەی خۆی شاردەوەو، گوتی: (ئایا دەتوانم ئەو تابلۆیە بکڕم)؟

(ئیتیان) وەڵامی دایەوە:

- (نەخـێر.. چونکە بڕوا ناکەم جۆرج واز لەو تابلۆیە بهێنێت، ئەوە هەروەها وێنەی خاڵۆی، واتە: پیاوە ئاینیەکەو دایکیشی تیایە)!

کەمـێك دوای ئـەوە (بۆل هرمان) خواحافیزی کردو، بە (لوسیان)ی گوت:

- (کـە هاوسەرگیرییەکەتان بوو، ملیۆنێك فرەنك بە کچەکەم و، دوو ملیۆنیش بە تۆ دەدەم).

(ئیتـیان) گوتی: (جا ئەگەر ئەوەت کرد، ئەوسا دەتوانی کەمێك لەو مافـە بـۆ لوسـیان بگەڕێنیتەوە، کـە تاوانـبارە بکوژەکـەی بـاوکی لـێی زەوت کردووە)!

(بۆل هرمان) ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو، لەگەڵ (لوسیان)دا چوونەدەر.

کاتێك (ئیتیان) و (جۆرج) بە تەنیا مانەوە، (ئیتیان) گومانەکانی خۆی لە بارەی (بۆل هرمان)ەوە پێڕاگەیاند، بۆ ئەوەی ئەوەی پێ بڵێت، کە لە ڕاستیدا بە تاوانباری دەزانێت، بۆیە بە گومانەوە ئەوەی بە گوێیدا چرپاند.

بۆ بەیانی ڕۆژی دووەم (لوسیان) بەڵگەنامەی خانەکەی بۆ (ئیتیان) ڕەوانکرد، (ئیتیان)یش بردییە لای ئەو هاوڕێیەی، کە جێگری وەزیری ناوخۆ بوو، دوای ئەوە گەڕایەوە ماڵەکەی و، هەواڵی بە خزمەتگوزارەکەی ڕاگەیاند: (سەفەر دەکەم)! پێیشی گوت: (بەڵام مەسەلەی ئەو سەفەرەم لای کەس و، تەنانەت لای جۆرجیش ئاشکرا نەکەیت).

٤٠ـ (لیزا بیرین، یان حەننە فۆرتیە)؟!

دوای ئەوەی تەندروستی (لوسی) بەرەو باشی هاتەوە، (حەننە) بەجێی هێشت، بۆ ئەوەی بێتە ماڵی (جۆرج)ی پارێزەرو، کاغەزەکانی بۆ بگەڕێنێتەوە.. کاتێکیش (جۆرج) کاغەزەکانی دەستکەوتەوە، ویستی خەڵاتی (حەننە) بکات، بەڵام (حەننە) ئەوەی ڕەتکردەوەو، گوتی:

ـ (ئەگەر دەتەوێت خەڵاتم بکەیت، ئەوا وەرە لەو کێشە یاساییە ڕێنماییم بکە)!

- (بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە خاتوونەکەم)!

- (ئایا یاسا ڕزقی ئافرەتێك دەبڕێت، ئەوە چییە دایکی ئەو ئافرەتە تاوانبارە)؟!

- (ئەو کارە زۆر ناڕەوایە، بەڵام یاسا هەقی بەسەردا نییە)!

ئینجا (حەننە) سەرجەم ژیانی منداڵی و، کارو دەرکرانەکەی (لوسی) لە کارگەی بە تەواوی بۆ گێڕایەوە، (جۆرج) بەمە زۆر کارتێکراو بوو، بە (حەننە)ی گوت:

- (کە ناوت برد، ئەو کچەم ناسی.. بەڵام نەمدەزانی تا ئەو ڕادەیە ئازاری چەشتووە)!!

- (گەورەم.. تکات لێدەکەم.. دەتوانی لە بارەیەوەی قسە لەگەڵ لوسیان و بۆل هرمان بکەیت، چونکە ئەوەی یەکەم هەق نییە کچێك بە تاوانی دایکی بسووتێنێت و، ئەوەی دووەمیش لەسەریەتی لوسی بۆ کارەکەی بگەڕێنێتەوە، چونکە کچەکەی ئەو بۆتە هۆی دەرکردنی لوسی لەسەر کار).

- (تۆ لیزا بیرینی وانا)؟

- (بەڵێ.. لوسیش وەکو کچم وایە)!

لێرەدا خزمەتکارەکە هاتە ژوورو، بە (جۆرج)ی گوت:

- (بۆل هرمان لە هۆڵی چاوەڕوانیدا چاوەڕێت دەکات).

ئیتر (جۆرج) بە (لیزا)ی گوت:

- (وەرە قسەی لەگەڵ بکە، ئەوە هەلێکی باشە)!

(لیزا) لەگەڵ (جۆرج) بۆ هۆڵەکە هاتن، تا ڕێك و ڕاست ڕوو بە ڕوو لەگەڵ (جاك جیرۆد) وەستا!! بەڵام تەمەنی ڕابردوو، ئەوەندەی گۆڕیبوون، سەرەتا کەسیان نەیتوانی ئەوی تر بناسێتەوە!!

(حەننە) لە (بۆل هرمان) پاڕایەوە، بەڵکو بەزەیی بە (لوسی) بێتەوەو، مافەکانی بۆ بگەڕێنێتەوە.. بەڵام هەرکە قسەی کرد، (جاك) یان (بۆل هرمان)ی ساختەچی ناسییەوە، بۆیە بە دڵڕەقییەوە پێی گوت:

- (ناتوانم یارمەتیی بدەم.. چۆن دەتوانم داواکاری کچەکەم ڕەتبکەمەوە، کە هەموو ئاسوودەییەکەی بەوە بەندە)؟!

- (بەڵام لوسی داماو ئازار دەچێژێت)!

- (ئەو هەموو گرنگیدانەت بە لوسی، وام لێدەکات بڵێم: تۆ هەبێ و نەبێ حەننە فۆرتیەی لە بەندیخانە ڕاکردوویت)!

(حەننە) ڕاچڵەکی! ترسی لێنیشت، خەریك بوو لە هۆش خۆی بچێت و، بە زەویدا بکەوێت، (بۆل هرمان)یش هەوڵیدا لە ماڵەکە بێتە دەرو، بانگی پۆلیس بکات، بەڵام (جۆرج) ڕێگەی نەدا، ئەوە بکات.. پێی گوت: (ئەو ژنە لە ماڵی منەو، نایەڵم کەس ئازاری بدات).. ئینجا بە (لیزا)شی گوت: (تۆ دەتوانیت بەو پەڕی ئازادی بچیتە دەر).. ئیتر (حەننە)ش هاتە دەر.

(بۆل) هەوڵی دا بە دوای بکەوێت، شوێن پێی بدۆزێتەوەو، بە دەست پۆلیسیەوەی بدات، بەڵام (جۆرج) پێی گوت: (بێگومان بۆ ئەوە هاتوویت، لەگەڵمدا لە هەندێ ئیش و کار بکۆڵینەوە، وا نا)؟!

(بۆل) ئیدی وازی هێناو، له ماڵی (جۆرج) مایەوە.. بەڵام (جۆرج) لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئەگەر ئەو بێودژنە حەننە فۆرتیە بێت، ئەوە ئەوپەڕی جێی ڕێزە، چونکە بەرگری لە کچی خۆی دەکات! ئەگەریش بێومژنە لیزا بێت؟! دیسانەوە شایانی ڕێزلێنانە، چونکە بە پاڵنەری مرۆیی، بەرگری لە کچێکی ستەملێکراو دەکات)!

بەڵام (حەننە) لەوە ترسا (بۆل) تووشی بکاتەوە بە تووشی پۆلیس و بەندیخانە، هەروەها بۆ حاڵی (لوسی)ش پەرۆش بوو، کە یاسا لەو ستەمەی لێی کراوە بێدەنگ دەبێت و، مافی گەڕانەوە سەرکاری بۆ زامن ناکات!!

بۆ بەیانی ڕۆژی دووەم (بۆل هرمان) بەرەو ماڵی (نۆفید) هات، ئەوەی پێڕاگەیاند، کە لە ماڵی (جۆرج)ی پارێزەر لە نێوان خۆی و (حەننە) ڕوویدا، (نۆفید) پێی گوت:

- (بێگومان تۆ هەڵەت کرد، کە زانیت حەننەیەو، یەکسەر ئاشکرات کرد، بەڵام هیچ نییە، نامەیەك بۆ پۆلیس دەنووسم و، لەو شوێنەیان ئاگادار دەکەمەوە، کە حەننە کاری تێدا دەکات).

- (کوڕە وریابە.. شتی وەها نەکەیت، چونکە ئەو کاتە جۆرج لەوە دڵنیا دەبێت، کە خەبەردەر منم و، لێم تووڕە دەبێت، منیش لە بارێکی ناسکدام، چونکە جۆرج گومانی لە مەسەلەی من هەیەو، لوسیانیش وا دەزانێت، حەننە بێ تاوانە، بە هەمان شێوە ئیتیانی وێنەکێشیش هەر حەننە بە بێ تاوان دەزانێت، کەوابێت، منیش باری ئەو هەمووانەم پێ نابرێت)!

- (بێ ئومێد مەبە پیاو.. من خۆم دەچم حەننە فۆرتیە دەکوژم.. چونکە من ئامادەم نیوەی خەڵکی سەر ئەو زەوییە لە بەر دڵی تۆو، بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆم بکوژم)!

- (بەڵام ئەو کوشتنە، دەبێ پۆلیس وای تێبگات قەزاو قەدەرە)!

- (لە هیچ مەترسە)!

بۆ بەیانی ڕۆژی دووەم، (ئۆڤید) خۆی وا لێکرد نەناسرێتەوەو، هات، چاوەدێریی خستە سەر ماڵی (حەننە) و (لوسی)، ژنێکی بینی سەبەتەیك نانی پێیە، بەمە دڵنیابوو، کە ئەو ژنە (حەننە)یە، بۆیە شوێنی کەوت.

٤١ـ (هەوڵێکی نوێی ئیتیان):

لە درێژەی هەوڵەکانیدا، (ئیتیان) چاوی بە سەرۆکی پۆلیس کەوت، داوای هەندێ زانیاریی لێکرد، لە بارەی (بۆل هرمان)ی میکانیکی، ئەو پیاوەی کە لە ساڵی ١٨٣٢ لە دایك ببوو.

(ئیتیان) ئەو زانیاریانەی لەو کاغەزە دەست خستبوو، کە لە پێناو خۆئامادەکردنی (بۆل) بۆ ژن هێنانی، بە دەستی خۆی نووسیبووی.

سەرۆکی پۆلیسیش بانگی پۆلیسێکی کرد، کە هەر لە زووەوە (بۆل هرمان)ی ناسی بوو، ئەو پۆلیسە باسی منداڵی (بۆل)ی بۆ (ئیتیان) و، چۆنیەتی دەرس خوێندنی بۆ کرد.. پاش ئەوە (ئیتیان) پرسی:

- (باشە.. بۆل هرمان لە نەخۆشخانەدا مرد)؟

ـ (نەخێر.. بەڵکو سەفەری ئەمریکای کرد، لەوێ لەگەڵ جێمس مۆرتێمر لە کارگەکەی ئەودا کاری کرد).
(ئیتیان) بەمە دڵنیابوو، لەو لێکۆڵینەوەیەی دەیکات، بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی، بەرەو ئەو خانەیەش هات، کە تیایدا پەڕەی زانیاریەکانی لەبارەی (لوسی) دزرابوو، کاتێك کوێخای گوندەکە، بەڵگەنامە ئەسڵییەکەی بە دەست (ئیتیان)ەوە بینی، سەرسام بوو!! جا لە بەر ئەوەی (دۆشمان) بەرپرسی تۆمارەکانی ئەو خانەیە بوو، کوێخا زانی، کە (دۆشمان) ئەو پەڕەیەی دزیوە، لە بەرامبەر ئەو پارەیەی، کە دەیکردە خەرجی و، ئەو سەیری پێدەهات، کە ئاخۆ (دۆشمان) ئەو هەموو پارەیە لە کوێ دێنێت!! هەروەها کوێخا (ئیتیان)ی لەوە ئاگادار کردەوە، کە (دۆشمان) لە (دارستانی پاشا)یە، بۆیە (ئیتیان) دەستبەجێ بەرەو ئەوێ هات، پرسیاری لە بارەوە کرد، بەڵام خزمەتکارەکە گوتی: (لەگەڵ خاتوو ئەماندا سەفەری کردووە، ڕۆژی یەکشەمە دەگەڕێنەوە).
ـ (ئەماندا کێیە)؟
ـ (کچێکی جوانە، لەگەڵ بارۆن ئەرنۆڵد هاتۆتە ئێرە، کە ناوبراو چەند ڕۆژێکە ئێرەی جێهێشتووە).
(ئیتیان) سوپاسی کردو، ئیتر گومانی نەما، کە ئەو (بارۆن)ە یەکێکە لە پیاوەکانی (بۆل هرمان)، بە یارمەتی (دۆشمان)یش ئەو پەڕەی تۆماری (لوسی)ی دەستکەوتووە، بەڵام (ئیتیان) نەی دەتوانی هیچ شتێك بکات، چونکە شوێنی (دۆشمان) و (ئەماندا) و (بارۆن)ی ساختەچیی نەدەزانی.. بۆیە گەڕایەوەماڵەکەی خۆی، لەوێدا هەواڵی

بیست، (جۆرج) پرسیاری دەکات، ئەویش چووە لای و، پێی ڕاگەیاند، کە هەندێ لێکۆلینەوەی کردووە.

ئێنجا (ئیتیان) درێژەی بە قسەکانی داو، گوتی: (من گومانم لە بۆل هرمان هەبوو، بەلام ئێستا بۆم دەرکەوت، کە ئەو گومانەم لە جێ نەبووە).

- (کەوابێت، واز لە لێکۆڵینەوەکانت دێنیت)؟

- (بێگومان).

بەلام (ئیتیان) لەم قسانەیدا لەبەر مەبەستێکی دلّی خۆی ڕاستی نەدەکرد، بەلکو لە دلّدا هەر بە گومانەوە بۆ (بۆل هرمان)ی دەڕوانی، چونکە دەیگوت: (داهێنراوەکەی ڕێك لە داهێنراوەکەی باوکی لوسیان دەچێت و، دواتریش ئەدی چۆن زانی؟! ئەو پەڕەی زانیاری لە بارەی لوسییەوە دەستبخات)؟!

٤٢ـ (هاوکارییەکی جێی ڕێز):

دوای ئەوەی (دۆشمان) چاك بوویەوە، کۆمپانیای هێلّی ئاسنی وەك باربوو پێنج هەزار فرەنکی پێدا، ئەم پارەیەشی لەگەلّ پارەکەی (ئەماندا) تێکەلّ کردو، بڕیاریاندا بە هۆیەوەی تۆلّە لە (ئۆفید) بسەننەوە.

(ئەماندا) ئەوەی بۆ (دۆشمان) ڕوونکردەوە، کە (ئۆفید) پەیوەندی لەگەلّ (بۆل هرمان) هەیە..چونکە بەلگەنامەکەی پێداوە، هەروەها

(ئۆفـید) لـە کارگـەدا ناچێتە لای (بـۆل هـرمان)، بەڵکو (بۆل هرمان) خۆی دێتە ماڵی (ئۆفید).

هەرچی (ئۆفید)ە، خۆی بۆ (حەننە) لە سەرووی باڵەخانەیەکدا لە بۆسـە خست و، کـە (حەنـنە) بـە ژێـریدا تێپەڕی، بەردێکی بەسەردا بەردایەوە، (حەنـنە) بـەم هۆیـەوە بە زەویدا کەوت، بەڵام برینەکەی ترسـناك نـەبوو.. (ئۆفـید) لـە لای خۆیـەوەی وایـزانی مـرد، بۆیـە بروسکەیەکی بـۆ (بـۆل هـرمان) کـردو، تێیدا هەواڵی ئەوەی پێدا، کە ئێوارە کاتژمێر حەوت، دێتە لای بۆ کارگە.

لـە کـاتی دیاریکـراو (ئۆفـید) گەیشـتە کارگـەو، بـە (بـۆل هـرمان)ی گوت: (حەنـنەم کوشت).. ئیـنجا گوتـی: (ئێسـتاش تکـای ئـەوە ناکەم چی تر لەم وڵاتە بمێنمەوە، بۆیە دەچمەوە ئەمریکا).

ـ (کەوابێت مانگانە مووچەکەت دەنێرمە ئەوێ، چونکە لە ڕاستیدا منیش ئیدیکە کارم بە تۆ نەماوە)!

ـ (بەڵام من پێم باشە پارەکەم بە یەکجار پێبدەیت).

ـ (ئاخـەر گـەر بـە یـەکجار پێـتی بـدەم، تـۆش بـە خـێرایی سـەرفی دەکەیت، دواتر دەست بەتاڵ دەمێنیەوە).

ـ (لـەوە مەترسـە.. بـەڵام ئـەوەش بـزانە: مـن نامەوێت ئەگـەر خوا نەخواستە تۆ مردی، من نان بڕاو ببم).

دوای ئـەم وتووێـژە لەسـەر ئـەوە ڕێککـەوتن، کـە (بـۆل) پێنجسـەد هـەزار فـرەنك بداتـە (ئۆفـید)، بـەڵام بـەو مەرجـەی لـە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا سەفەر بکات.

پاش ئەوە بە ماوەیەکی کورت، لە یەك ئۆتۆمبێلدا هەردووکیان ڕۆیشتن، (دۆشمان) چاوەدێری کارگەکەی دەکرد، بۆیە شوێنیان کەوت، بەڵام (ئۆفید) هەستی کرد، ئۆتۆمبێلێك لە دوایانە، وای گومان برد (ئەماندا)ی تیایە، بۆیە بە زیرەکی خۆیانی لێ ون کرد.

بۆ بەیانی ڕۆژی دووەم، (دۆشمان) و (ئەماندا) لە هۆڵی هوتێلەکە بوون، (ئیتیان)یان لێ هاتە پێش، کە پێشتر لە بارەیانەوە لە خاوەنی هۆتێلەکە پرسیاری کردبوو، ئەویش ئەوانی پێ نیشاندابوو.

(ئیتیان) هاتە لایان و، گوتی: (دەمەوێت بە تەنیا لەگەڵ دۆشمان قسە بکەم).

(دۆشمان) گوتی: (ئاخەر خاتو ئەماندا هاوڕێمەو، من هیچی لێ ناشارمەوە).

- (باشە.. دەمەوێت بزانی، کە من بۆ یارمەتی تۆ هاتووم، جا مەترسە، من بە مەسەلەی ئەو تۆمارە دەزانم، کە لە لای کوێخای گوندەکە بردووتە).

(دۆشمان) ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، بەڵام (ئیتیان) درێژەی بە قسەکانی داو، گوتی: (ئەگەر بێت و ناوی ئەو کەسەم پێ بڵێیت، کە ئەو تۆمارەی لە تۆ داوا کردووە، ئەوا منیش تۆ دەرباز دەکەم، بە پارەی خۆم، وا دەکەم لە وەزارەتی ناوخۆدا بڕیاری دەستگیرکردنت هەڵبووەشێننەوە).

لێرەدا (دۆشمان) و (ئەماندا) هیچ چاریان نەما، ناچار پێیان گوت: (ئەو کەسە ئۆفید بوو).. هەواڵی ئەو کاغەزانەشیان پێدا، کە لە لای

خۆیـدا دەیانپارێزێـت، بـۆ ئـەوەی بەسـەریاندا زاڵ بێـت.. هـەروەها (ئیتـیان) ئەوەشـی زانی، کە (دۆشمان) پەیوەندی بە (بۆل هرمان)ەوە هەیــە، بۆیــە هــەموویان لەســەر ئــەوە ڕێککــەوتن، کــە بــە نــاوی (ئۆفـید)ەوە بروسـکەیەك بـۆ (بـۆل هـرمان) بکـەن، تـیایدا بنووسـن: (ئـەم شـەو وەرە ماڵەکـەم).. بـە مەرجێـك (دۆشمان) چاوەدێری (بۆل هـرمان) بکات و، شـوێنی بکەوێت، تا بزانێت ماڵی (ئۆفید) لە کوێیە، ئینـجا بـۆ جاری دووەم بێـتەوەو، دەست بەسەر کاغەزەکانی نێو ئەو ماڵەی (ئۆفید)دا بگرێت.

پـاش ئـەوە لـە یەکتر جیابوونەوەو، هەر یەکەیان دڵنیابوو، لە پاکی و دڵسۆزی هاوڕێکانی تری.

٤٣ـ (ئاهەنگێکی سەرکەوتوو):

لـە نامەیـەکی ئـیمزا نەکـراودا، کـە (ئۆفـید) بـۆ پۆلیسی ڕەوانکـرد، تـیایدا نووسـیی: (حەنـنە فۆرتـیە کـە لـە یـەك لـە نانەواخاکانـەکانی پایتەختـدا کاردەکات، بە ساختە ناوی لیزا بیرینی لە خۆی ناوە).

دوای دوو ڕۆژ، (ئۆفــید) لــە یــەك لــەو قاوەخانانــە بــوو، کــە نانفرۆشەکان تیای دادەنیشن، گوێی لێیان بوو، لە بارەی ئەوە دەدوان، کە بە نیازن ئاهەنگێکی ڕێزلێنان بۆ بێوەژنە لیزا بگێڕن، ئەمەش بە هۆی چاکبوونەوەی.. (ئۆفید) بەمە زۆر دڵخۆشبوو، چوو بیتاقەیەکی کـڕی، بـۆ ئـەوەی بـەیانی لـەو ئاهەنگـەدا بـتوانێ بچـێتە ژوورو، بەشداری بکات.

بۆ بەیانی بە مەبەستی ئامادەبوون لە ئاهەنگەکە، (ئۆفید) هاتەوە قاوەخانەکە، لە شوێنێکی تەك پەنجەرەدا دانیشت، هەر لەو کاتەدا قەدەر وابوو، (ئەماندا) لە دەرەوە بەسەر شۆستەکەدا تێپەڕێت و، چاوی بە (ئۆفید) بکەوێت، بەڵام بێ ئەوەی (ئۆفید) ئەو ببینێت، بۆیە (ئەماندا) یەکسەر هاتە قاوەخانەکە، چوو لە شوێنێك دانیشت، کە چاوی بەسەر (ئۆفید)ەوە بێت و، لە هەمان کاتدا (ئۆفید)یش نەتوانێت ئەو ببینێت.

پاش کەمێك (ئۆفید) بانگی یەك لە ژنە خزمەتکارەکانی کرد، لە پێشیدا سەرەتا بە (لیزا)ی بێوەژنی دا هەڵدا، دواتر پێی گوت: (ئەم دوو تاکە بازنانەت پێ دەدەم، ئەگەر هات و، چەند دڵۆپێکی ئەو شلەیەت کردە ئەو کوپەی (لیزا) شتی پێ دەخواتەوە، چونکە ئەم شلەیە وای لێدەکات گۆرانی بڵێت و، گوێمان لە دەنگە خۆشەکەی ببێت).

- (جا ئایا دەنگی خۆشە)؟!

- (بەڵێ دەنگی موعجیزەیەکە لە موعجیزەکان.. بێگومان ئەگەر گوێمان لە دەنگی بوو، هەموومان پێی دڵخۆش دەبین، لە پاشان من دوو تاك بازنم بۆ ئەویش ئامادەکردووە، دوای گۆرانی گوتنەکەی وەك ڕێزلێنانێکم لە بۆی، پێشکەشی دەکەم).

ژنە خزمەتکارەکە بە سوپاسەوە ڕازی بوو، بەڵام (ئەماندا) کە گوێ بیستی ئەو قسانە بوو، بە پەلە خۆی گەیاندە ژنە خزمەتکارەکەو، مەسەلەی (ئۆفید)ی تێگەیاند، بۆیە لەگەڵی ڕێککەوت، کە ئەو ژنە

شلەکە بکاتە نێو کوپی (نۆفید) خۆی، بۆ ئەوەی بە پێچەوانەی ویستی گلاوی، خۆی دان بە تاوانەکانی خۆیدا بنێت.

ئاهەنگ دەستی پێکرد، (نۆفید) دیارییەکەی خۆی پێشکەشی (لیزا) کرد، لە پاشان شەربەتەکەی خۆی بە ئاسوودەییەوە خواردەوەو، بە بوونی پۆلیسەکان لە نێو هۆڵەکەدا دڵخۆشبوو، کە ئێستا (لیزا)یان بۆ دەردەکەوێت و، دەیگرن!

کەچی پاش ماوەیەکی کەم، (نۆفید) لە شوێنی خۆی هەڵسایەوە، کۆکەیەکی توندی گرت و، پاش ئەوە دەستی کرد، بە دەرخستنی نهێنییەکانی، لەو قسانەی کردی، گوتی: (من بارۆن ئەرنۆلد نیم.. بەڵکو نۆفید سۆلیڤۆمە..)، هەروەها ئەو کارانەشی ڕوونکردەوە، کە لە بۆ (جاك جیرۆد)ی بکوژی (جیل لابرۆ) ئەنجامی داوە، ئەو (جاك جیرۆد)ەی ناوی (بۆل هرمان)ی بە ساختە لە خۆی ناوە!! ئینجا ڕووی بۆ (لیزا) وەرگێڕاو، پێی گوت: (تۆش بێوەژنە لیزا نیت، ئێستاکەش کە ئەو کوپەی دەستت دەخۆیتەوە، دان بە هەموو ڕاستییەکدا دەنێیت).

(حەننە) هاواری کرد: (وس بە).

بەڵام (نۆفید) لە قسەکانی بەردەوام بوو و، گوتی: (تۆ حەننەیت.. تۆ حەننەیت).

بۆیە (حەننە) چی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت، هاواربکات و، بڵێت: (بەڵێ من حەننە فۆرتیەم.. بەڵام خەڵکینە ئێوەش دانپێدانانەکانی

ئەو پیاوەتان بیست، کە بێ تاوانی من دەردەخات، جا وەرن دادگایی من بکەن، من ڕازیم بە حوکمی ئێوە).

لێرەدا پۆلیسەکان بەرەو ڕووی حەننە هاتن، بۆ ئەوەی دەستگیری بکەن، بەڵام ئامادەبووان (حەننە)یان لەنێو خۆیاندا شاردەوەو، هەڵاتنیان بۆ ئاسان کرد، بۆیە بە تەنیا (ئۆفید)یان دەستگیر کرد.

هەرچی (ئەماندا)شە، گەڕایەوە ماڵ، بینی (دۆشمان) نامەیەکی بۆ جێهێڵاوە، تیایدا دەڵێت: (من شوێنپێیەکانی ئۆفیدم دۆزیوەتەوەو، ئەمشەو ناگەڕێمەوە ماڵ).

٤٤ـ (کۆتایی):

(ئۆفید) بۆ بەندیخانە گوازرایەوە، بەڵام ڕەتی کردەوە لەوەی گوتبووی، دان بە هیچێك بنێتەوە.

(بۆل هرمان)یش لەو شەوەدا، دوای ئەوەی نامەکەی پێگەیشت، چووە ماڵی (ئۆفید)، (دۆشمان) چاوەدێریی دەکرد، کاتێکیش (ئۆفید)ی لە ماڵەکەدا نەبینی، دەرگاکەی داخست و، لە ژووردوە چاوەڕووانیی کرد، بەڵام کە هەر نەهاتەوە، ڕۆیشت و، ماڵەکەی جێهێشت، لەو کاتەدا (دۆشمان) بە ئەسپایی هاتە نێو ماڵەکە، دوو سەنەدەکانی و، کاغەزە تایبەتەکەی بە (ئەماندا) و، وەفاتنامەی ئەو نەخۆشخانەیەی دۆزیەوە، کە دەریدەخات، (بۆل هرمان)ی ڕاستەقینە مردووە، ئیدی ئەمانەی هەموو هەلگرت و، پاش ئەوە هاتە لای

(ئـەماندا)، دواتـر بەیەکـەوە هاتـنە مـاڵی (ئیتـیان)، لـەوێدا (دۆشمان) ئاگاداری کـردەوە، لـەوەی کـردوویەتی، هـەر لەو ژوورەدا حەمباڵەکان ئەسـپە دارینـیە کۆنەکـەی (جـۆرج) و تابلۆکـەیان بـۆ (جـۆرج داریـە) دەگوازتـەوە، ئەسـپەکەیان لـە دەست بەربوویەوە، شکاو، شتەکانی نێو زگـی پـەرش و بڵاوبوونـەوە، (ئیتـیان) بەمـە غەمـبار بـوو، چـونکە (جـۆرج داریـە) ئـەو ئەسـپە کۆنینەی خۆی زۆر خۆشدەویست، کە بە تاکـە یادگـاری دایکـی، واتـە: خوشکی پیاوە ئاینیەکەی دەزانی، بۆیە (ئیتـیان) هەڵسـا ئـەو پـەڕە کاغەزانـە کۆبکاتـەوە، کـە لەنـێو زگـی ئەسپەکە پەرش و بڵاوببوونەوەو، تیایاندا ئەو نامەیەی دۆزیەوە، کە (جـاك جیرۆد) لـە سـاڵی ١٨٦١دا بـۆ (حەنـنە)ی نـاردبوو، ئـیتر هاواری سـەرکەوتنی لـێ هەڵسـاو، خـزمەتکارەکەی ڕەوان کـرد، بـۆ ئـەوەی بـە پەڵە بە دوای (لوسیان)دا بچێت و، بیهێنێتە ئەوێ.

کاتـێك (لوسـیان) گەیشـتە جـێ، (ئیتـیان) پیرۆزبایی لێکردو، گوتی: (بۆمـان دەرکـەوت، کـێ بـاوکی تـۆی کوشـتووە، لەوەشـدا ئـەم پـیاوە بەسۆزە (دۆشمان) یارمەتی دام).

(لوسـیان) ڕووی بۆ (دۆشمان) وەرسووڕاندو، گوتی: (بکوژەکە کێیە؟ پێم بڵێن).

(ئیتـیان) لـە باتی (دۆشمان) وەڵامی دایەوە: (دوای کەمێکی تر پێت دەڵێین، بەڵام ئێستاکە ئێمە هەمووومان دەچینە ماڵی جۆرج داریە).

لـەو کاتـەدا (لوسـی) نـیگەران بـوو، بـە هـۆی نەگەڕانـەوەی (لـیزا)ی بـێوەژن، کـە لە دەستی سەربازەکان ڕایکردبوو و، نەگەڕابووەوە، بۆیە

(لوسی) چووه ماڵی (جۆرج)ی پارێزەرو، ئەو مەسەلەیەی تێگەیاند، ئەویش دڵنیای کردەوە، کە وەبکات، بە بێ ترس (لیزا) بۆ ماڵەکەی بگەڕێتەوە، پێشی گوت: (هەرچەندە ئەو بێوەژنە حەننە فۆرتیەشە)!

(لوسی) هاواری کرد: (بەڕاستتە؟! یانی ئەوە دایکمە؟! تکا دەکەم گەوردم بڕوا بکە بێتاوانە).

- (مەترسە.. من خۆم مەسەلەکەی دەگرمە ئەستۆ).

لەو ساتەدا (لوسیان) و (ئیتیان) و (دۆشمان)یش بە ژوور کەوتن، (ئیتیان) بە (جۆرج)ی گوت: (کوڕی خۆم ئەمڕۆکە تەمەنت گەیشتۆتە بیست و پێنج ساڵ.. بۆیە وەسیەتی پیاوە ئاینیەکە جێبەجێ دەکەم و، ئەم نامەیەت بۆ دەخوێنمەوە:

((کوڕی ئازیزم:

لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٨٦١ ژنێك بە ناوی حەننە فۆرتیە تۆی هێنایە لامان، کە بە کوشتن و دزی و کارگە سووتاندن تاوانبار کرابوو، بەڵام سوێندی خوارد، ئەو بێ تاوانە، منیش بڕوام پێکرد، بەڵام دواتر سەربازەکان گرتیان و، ئێمە پەروەردەکردنی تۆمان گرتە ئەستۆ...))

لێرەدا فرمێسك پەڕیە چاوی هەمووان و، گریان، (جۆرج) و (لوسی)ش باوەشیان بە یەکدا کردو، خەریك بوو بڕوا نەکەن، کە ئەوان خوشك و برای یەکن!! (جۆرج) گوتی: (دایکمان داماوە.. ستەملێکراوە.. بەڵام بەڵگە لەسەر بێتاوانییەتیی نییە)!

(ئیتیان) لێی نزیك بوویەوەو، ئەو نامەیەی بۆ خوێندەوە، کە لە زگی ئەسپە دارینیەکە دۆزیبوویەوە، بەمە هەموویان هێندە دڵخۆش نەبوون کەس بزانێ، بەڵام (جۆرج) گوتی: (ئاخەر جاك جیرۆد مردووە)؟!

(ئیتیان) گوتی: (نەخێر.. بەڵکو ئەگەر تۆ بەراورد لە نێوان خەتی بۆل هرمان و خەتی جاك جیرۆد بکەیت، کە بێگومان نووسراوی بۆل هرمانت لا دەست دەکەوێت، بۆت دەردەکەوێت، کە ئەم دوو ناوە یەك کەسن).

(جۆرج) یەکتاو ڕۆشت لە نێو دۆسیەی تایبەت بە (بۆل هرمان) نامەیەکی بە خەتی (بۆل) دەرهێناو، بە نووسراوێکی (جاك جیرۆد)ی بەراورد کرد، بۆی دەرکەوت، هەردووکیان یەك خەتن!!

لێرەدا (لۆسیان) دەستی کرد بە نەفرەت کردن لە (بۆل هرمان) و، بۆی دەرکەوت بە فڕوفێڵەکانی هەڵخەڵەتاوە، ئینجا لە (لوسی) نزیکبووەوە و، (ئیتیان)یش داوای لە ئامادەبووان کرد، کە هەموویان پێکڕا بچنە ماڵی (بۆل هرمان).

(حەننە فۆرتیە)ش ئەو کاتە لە ماڵی (بۆل هرمان) بوو، بەوە تاوانباری دەکرد، کە (جاك جیرۆد)ە، بەڵام ئەو پێی دەگوت: (وس بە.. تۆ شێتیت).. ئینجا (ماری) هاتە ژوور، (بۆل هرمان) شڵەژاو، گوتی: (ئەم شێتە وڕێنان دەکات، با لەو ماڵە دەری بکەین).

بەڵام (حەننە) بە (ماری)ی گوت: (من شێت نیم خاتوونەکەم.. بەڵکو قوربانی دەستی ئەو باوکە خوێنڕێژەتم).. ئینجا تەواوی

کارەسات و ڕووداوەکانی بۆ (ماری) گێڕایەوە، هەرچەندە (بۆل هرمان) هەوڵیشی دا بێدەنگی بکات، بەڵام بێسوود بوو.

بۆیە پاش کەمێك (بۆل هرمان) لە (حەننە) هەڵسایەوەو، ویستی بیخنکێنێت، بەمە (ماری) بۆی دەرکەوت، کە (حەننە) ڕاست دەکات، هەر لەو ساتە کە (بۆل) پەلاماری (حەننە)ی دەدا، (دۆشمان) و هاوڕێکانی گەیشتنە ماڵەکەی، خزمەتکارەکە هاتە ژوورو هەواڵی بە (بۆل) دا، کە ئەو میوانانەی چاوەڕوانی هاتنە ژوورەوە دەکەن.. بۆیە (بۆل) (حەننە)ی ڕاکێشایە ژوورێکی ترو، دەرگای لەسەر کلیل دا، دوای ئەوە میوانەکان هاتنە ژوور، یەکەم شت (ئیتیان) بە (بۆل)ی گوت:

- (لە درێژی بیست و یەك ساڵدا، سەد هەزار فرەنك چەندی قازانج لێ دەکەوێتەوە)؟

- (بێگومان دوو سێ هێندەی خۆی.. بەڵام بۆچ ئەم پرسیارە)؟!

- (چونکە بەڕێز تۆ ئەو پارەیە قەرزاری لوسیان لابرۆی).

ئینجا ئەو نامەیەی بۆ خوێندەوە، کە بەر لە بیست و یەك ساڵ بۆ (حەننە)ی نووسیبوو، بەمە (جاك) زانی لە کۆتایی خۆی نزیك بۆتەوە، نەشیتوانی هیچ بکات، چونکە چەکی نەبوو.

پاش ئەوە (ئیتیان) پێی گوت: (دەبێ بە نووسین دان بە هەموو تاوانەکانتدا بنێیت).. ئینجا بۆ ئەو مەبەستە کاغەزو قەڵەمێکی پێدا، بەڵام ڕەتی کردەوە ئەم دانپێدانانەی خۆی بنووسێتەوە، مەبادا

ئەمـە ببێـتە لەکە بۆ ئابڕوی (ماری)، بەڵام (ماری) بەرەو باوکی هات و، پێی گوت:

- (بابە هەموو شتێك بنووسە.. قەرزی لوسیانیش بدەرەوە، هەرچی منیشم سوپاسی خودا دەکەم، ئەگەر تەمەنم زۆر درێژ نەبێت).

پاش ئەوە لە ژوور هاتە دەرو، کۆکەکەی زۆر توند بوو.

ئـیدی وای دەبیـنی، بارەکـە چـەند کاریگـەر بووبێـت؟! کە هەواڵیان دایـە (حەنـنە): (جـۆرج کـوڕی تـۆیـە)!! ئـەوە سـەبارەت بە ئەو، بەس بوو بۆ ئەوەی ئازاری بیست و یەك ساڵی پێشووی لە بیر بچێتەوە!!

کاتێکیش ئامـادەبووان لـە ژوورەکـە هاتـنە دەر و، بە هۆڵە گەورەکە تێپەڕین، بینییان (ماری) گیانی دەرچووەو، لە تەك خۆیدا نامەیەکی جێهێڵاوە، تیایدا نووسیویەتی:

((بۆ لوسی فۆرتییە:

مـن سـتەمم لێـت کـرد.. تـکا دەکـەم بمبەخشیت و، دوعای خێرم بۆ بکەیـت، ئـەوەش لـە بـیر مەکـە، کـە مـن تـا ئەوپـەڕی لوسیانم خـۆش دەویست)).

دوای چەند مانگێك حوکمی بەندکردنی هەتا هەتایی بەسەر هەر یەکە لـە (بـۆل هـرمان) و (ئۆفـید)دا درا.. بەڵام (بۆل) مردنی بەلاوە خۆشتربوو لە بەندیخانە، بۆیە خۆی کوشت.

هەرچـی (لوسـی) و (لوسـیان)یشـن پەیمانی هاوسەرێتییان بەست و، بوونـە ژن و مـێردی یـەك.. بەمـە ئاسـوودەیی ئـەوان و، ئاسـوودەیی

(جــۆرج) و، ئاســوودەیی (حەنــــنە)ش دوای ئـــازاری ســـاڵانێکی دوورودرێژ وەدی هات و، خوای گەورە هەمووانی بە یەك شادکردەوە.

تەواو...

*- مێردمندالانی ئــازیز:*

ئەو ڕۆمانەی خوێندتانەوە، لە بنجدا ڕۆمانێکی گرنگی (کزافیە دی مونتابین)ە، بەم شێوەیە لە لایەن لیژنەیەك لە گەورە نووسەرانی (کتێبخانەی جیهانی بۆ کچان و کوڕانی لاو) لە پاڵ کۆمەڵێك لە شاکارە ئەدەبیە جیهانییەکانی تر کورتکراوەتەوە، بۆ ئەوەی سوود بە خوێنەرانی ئاستی ئێوە بگەیەنێت.

ئەم ڕۆمانە بە یەك لە شاکارە هەرە گرنگەکانی مرۆیی هەموو ئەدەبی جیهانیدا دەژمێردرێت.

ڕۆمانێکە لە ئاستی (بێنەوایان)ی (ڤیکتۆر هیگۆ)یە.. لەبەر ئەوە بۆ زۆربەی زمانەکانی دنیا وەرگێڕدراوەو، چەندین جار لەسەر شانۆ نوێندراوە.. بە تەنیا چاپە عەرەبیەکەی لە نێوان ساڵانی ١٩٧٧و ١٩٧٩ چوار جار چاپکراوەتەوە، لەبەر ئەوە، منیش بە پێویستم زانی ئێوەی کوڕان و کچانی کوردیش بە زمانە شیرینەکەی خۆتان، ئەو بەرهەمەتان بخرێتە بەردەست، بۆیە وەرمگێڕایە سەر کوردی و، پێشکەشی ئێوەی جێ ئومێدی میللەتەکەمانم کرد.

بەو هیوایەی سوودی لێوەرگرن، ئەگەر ناخۆشیەکتان خوانەخواستە بەسەرهات، وەکو (حەنـنە) خۆڕاگر بن و، دڵنیا بن لەوەی، ئەگەر ڕۆژگارێکیش مافەکانی هەندێکتان پێشێل بکرێت، بەلام سەرەنجام خوای گەورە دەروی خێری خۆیتان بۆ دەکاتەوەو، هەر هەق و خاوەن هەق سەردەخات.

دڵسۆزتان: ئیدریس عەبدوڵلا
٢٢ی نیسانی ٢٠٠٤

ئەم رۆمانە لە ئاستی رۆمانی (بێنەوایان)ی (ڤیکتۆر هیگۆ)یە، لەبەرئـــەوە بۆ زۆربەی زمانەکـــانی جیهان وەرگێردراوە.
ژنێکە بە تاوانێک تۆمەتبار دەکرێت، خۆی بێتاوانە، بەم هۆیەوە بیست ســـاڵ لە بەندیخانە و چەرمەسەری بەسەردەبات، منداڵەکانی ون دەبن و هەواڵی لێیان نامێنێ، لەولاوەش تـــاوانباری راستەقینە بەوپەری ئازادی و خۆشی دەژیت، بەڵام سەرەنجام دادگری خوا راستیەکان ئاشکرا دەکات، تاوانبار ریسوا دەبێ، ژنە بێتاوانەکەش رزگار دەبێت و بە منداڵەکانی شاد دەبێتەوە.

گرافیە دی مونتاپین
ژنە نانفرۆشەکە
رۆمان بۆ مێردمنداڵان



لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر لە هەولێر
ژمارە (١٩١) ی ساڵی (٢٠٠٤)ی دراوەتێ

نرخی (٢٠٠٠) دینارە